زنجیرەی
خێـزانـی
سەردەم

SMART DEVICES AND
THE CURRENT GENERATION

03

# ئامێری زیرەک و منداڵی سەردەم

## ڕێبەری کردارەکی بۆ پەروەردەکاران




ئامادەکردنی:
**نورە بنت مسفر القرنی**

وەرگێڕانی:
**ئـالان عومەر سلێمـان**




# ئامێری زیرەك و منداڵی سەردەم

## ڕێبەری  کردارەکی بۆ پەروەردەکاران


**ئامادەکردنی:  نورە بنت مسفر القرني**

**وەرگێڕانی: ئالان عومەر سلێمان**





چاپی یەکەم ١٤٤٥ك -٢٠٢٤ز



**نووسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 65

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

\ tafseeroffice

ئامادەکردنی پێڕست- نووسینگەی تەفسیر

القرني، نورە بنت مسفر

ئامێری زیرەك و منداڵی سەردەم، ڕێبەری کردارەکی بۆ پەروەردەکاران،  نورە بنت مسفر القرني (ئامادەکار)، ئالان عومەر سلێمان (وەرگێڕ)

١٧٦ لاپەڕە،

١٤*٢١ سم

بابەت، فیکری، پەروەردەیی

ISBN: 978-9922-690-47-6

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/

هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٣١٦)ی ساڵی (٢٠١٩) پێدراوە.


"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیرو بۆچونوی نووسینگەی تەفسیر بێت"


دیزاین، نووسینگەی تەفسیر

# ئامێری زیرەك و منداڵی سەردەم

## ڕێبەری کردارەکی بۆ پەروەردەکاران

نووسینی:
نوره بنت مسفر القرني

وەرگێڕانی:
ئالان عومەر سلێمان

# ناساندنی زنجیرەکە

گەنجی موسڵمان بە گشتی و کۆمەڵگای کوردەواری بە تایبەت؛ ڕۆژانە ڕوبەڕووی بیرۆکەی نوێی ناباو دروستکراو، پتر ئاڕاستەکراو دەبنەوە. مەبەست لەم بیرۆکە ئاڕاستەکراوانەش، تێکدان و سەرگەردان کردنی مرۆڤ بەگشتی و چەند کۆمەڵگایەك بەتایبەت؛ بۆ مەرامی بڵاوکردنەوەی چەندەها بیرۆکەی بێژمارە.

لەم سۆنگەیەوە نووسینگەی تەفسیر وەك کاری هەمیشەیی خۆی بە ئەرکی زانیوە بەڕووی هەر بیرۆکەیەکی ناباو هەڵبشاخێ کە ئاڕاستەی کۆمەڵگاکەمان دەکرێت.

لەم ڕووەوەش، هەڵساین بە وەرگێڕان و نووسینی زنجیرەیەك کتێبی سادە و ڕەوان، بەجۆرێك خوێنەرانی قۆناغی پێشکەوتووی بنەڕەتی و ئامادەیی بتوانن بە ئاسانی هەرسی بکەن و تەنانەت زنجیرە کتێبەکە بەجۆرێك دیزاین کراوە؛ کە خوێندکارانی زانکۆ و مامۆستا و پسپۆڕانیش سوودی گەورەی لێ ببینن و ببن بە هەوێنی سەرچاوە گرنگەکانیان.

# دەروازە...

کاتێك ئاراستەی توێژینەوە پەروەردەییەکان بەرەو چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان دەڕۆنك، نەك نیشانەی نەخۆشییەکان، ئـەوکات ئێمـە لەسـەر ڕێگەیـەکی دروسـت دەڕۆیـن بـۆ چارەسـەرکردنی پرسـە پەروەردەییەکان و کێشەکان لە بنج و بناوانیانەوە.

ئـەم توێژینەوەیـەیش یـەکێك لـەو توێژینـەوە پەروەردەییانـەی ڕواڵەت تێدەپەڕێنێت بـۆ ئـەوەی بگاتـە قووڵاییـەکان، بگاتـە دڵ و عەقڵ، بۆ ئەوەی فیترەتی منداڵ بەئاگابهێنێتەوە و بە پـەروەردگاری مەزنی ببەسـتێتەوە، تـا بەهۆیـەوە خاوەنەکـەی لەسـەر تاموچـێژی چاودێریکردن و شیرینیی ئارامگرتن لە بەرامبەر ئـارەزووە زۆرەکـان بژی.

ئەوەی ئـەم توێژینـەوە جیادەکاتـەوە، ئەوەیـە، کـە کۆمـەڵێك پێشـنیاری کرداریـی لـەخۆگرتوون بـۆ دەسـتپێکردنی ئـەم پرسـە پەروەردەییە (بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن لای منداڵ)، ئەمەیش بۆ ئـەوەی ببێتـە پاڵپشـتێك بـۆ دایکـان و باوکـان بـە مەبەسـتی دەستپێکردن بەم جۆرە پەروەردەیە.

نەخێر بۆ خۆبەدەستەوەدان بۆ ئامێرە ئەلیکترۆنییـەکان... هـیچ شتێك قورس نییە.. هـیچ شـتێك ئەسـتەم نییـە.. تاکـە چارەسـەر

بریتییه لـه: کـارکردن و دەسـتپێکردن لـه ئێسـتاوه، چـونکه هـەر دواکەوتنێك لەم کاره بەروبوومێکی پڕبایەخمان لەدەست دەدات، کـه ئومێدمان هەیه له ژیانی منداڵەکانماندا ببینین.

خوای گەوره به بینینی منداڵەکانمان، ئۆقرەیی و ئاسـوودەیی بـه چاوی هەموان ببەخشێت...

**د. علی بن محمد بن إبراهيم الشبيلي**

**ئەندامی دەستەی خوێندن له زانکۆی (ئیمام)**

**توێژەر و ڕاهێنەری خێزانی و پەروەردەیی**

# دەستپێك...

بابەتی خۆچاودێریکردن لە لای منداڵ لە بابەتە هەرە گرنگەکان ئەژمار دەکرێت، کە کۆمەڵگە زۆر پێویستی پێیەتی. مەبەست لە خۆچاودێریکردن بریتییە لە: چاندنی ئەو بەهایانەی، کە وا لە منداڵ دەکەن خۆی چاودێریی رەفتارەکانی خۆی بکات.

لە گرنگترین ئەو بەهایانەی کەسایەتیی منداڵی موسڵمان دروست دەکات، ناسینی خوای پەروەردگارە، کە ئەو زاتە دەمانبینێت و دەمانبیستێت. منداڵ لەناو ئەم جۆرە دەستەواژانە و دووبارەبوونەوەیان لە مێشکیدا، گەورە دەبێت.

رێگەکانی خۆچاودێریکردن منداڵ چەند جۆرێکن، لەوانە ڕاستەوخۆ، هەیشیانە ناڕاستەوخۆ، وەك: ئامۆژگاری بە چیرۆك و سوودوەرگرتن لە ڕووداوەکان، خوێندنەوە و ڕاهێنان ئەنجامدان.

بۆ نموونە: ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ڕۆژووگرتن، بەخشین،

یارمەتیدانی هەزاران، هاوکاریکردنی هاوڕێیان" ئارامگرتن، لێبووردەیی، وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکە و زاڵبوون بەسەر تووڕەیی و... هتد.

لە ئێستادا جیهان لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستی بە گەشەپێدان و ڕاهێنانی منداڵ هەیە لەسەر بابەتی خۆچاودێریکردن، چونکە پێشکەوتنی خێرای زانست و تەکنەلۆژیا بۆ ئامێرەکانی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، ئاسان دەستگەیشتنی منداڵ و هەرزەکاران پێیان و بەدەستهێنانی زانیارییەکان، لەوانەیە کاریگەرییەکی ئێجگار خراپیان هەبێت ئیتر چ لەسەر لایەنی ئایینی بێت، یان لەسەر لایەنەکانی تر وەك: ڕەوشتی، پەروەردەیی، دەروونی، کۆمەڵایەتی و تەندروستی.

ژمارەیەکی زۆر توێژینەوە هەن، کە باس لە لایەنە خراپ و باشەکانی ئەم دیاردەیە دەکەن، لەوانە توێژینەوەیەکە زاناکانی زانکۆی (بۆستن)ی ئەمریکی بە لە ڕێکەوتی ١٣ی کانوونی دووەمی ٢٠١٥ ئەنجامیان داوە و لە گۆڤاری (پزیشکی منداڵان) بە ناونیشانی (فێرکردنی ئامێرەکان لای منداڵان) بڵاوبووەتەوە.

توێژینەوەکە باس لە بەکارهێنانی منداڵان بۆ تەکنەلۆژیا دەکات لە نموونەی مۆبایل و ئامێری تر، سەرباری ئەوەی جەخت لەسەر گرنگیی فێربوونی ئەم ئامێرانە دەکاتەوە بۆ منداڵان، بەڵام ئاماژە بە مەترسییەکانی بەکارهێنانیان دەکات، کە تاکو ئێستا بە ڕوونی دەرنەکەوتوون. لە دیارترین لایەنە نەرێنییەکانی بەکارهێنانی مۆبایل، کە دەکرێت کار بکاتە سەر منداڵ بەر لە قۆناغی چوونی بۆ قوتابخانە، بریتییە لەو نارێکی و ناتەواوییەی لە گەشەی کۆمەڵایەتی و دەروونیی منداڵدا ڕوودەدات، کار دەکاتە سەر کارلێکی دەروونی لەگەڵ کەسە نزیك و هاوڕێکانی. توێژەران ئاماژە بەم ڕۆڵە خراپەی دەکەن، کە ئەم جۆرە ئامێرانە لەسەر وریایی منداڵ هەیانە، بە شێوەی نیمچە خۆکار (میکانیکی) کاریگەرییان لەسەریان دەبێت. لە زۆربەی کاتدا ئەم جۆرە بەرنامانەی لەناو ئامێرەکاندا هەن و منداڵ بەتەنیایی بەکاریان دەهێنێت - ئینجا بۆ فێرکردن بن یان بۆ یاری - پەیوەندی گرێدانی ڕاستەقینەی لەگەڵ هاوڕێکانی لەدەست دەدات. وێڕای ئەوەی توێژینەوەکان ڕوونی دەکەنەوە تا ماوەی بەسەربردنی منداڵ لە بەرامبەر شاشەکان - ئینجا تەلەفزیۆن بێت یان هەر شتێکی تر - زۆرتر بێت، گەشەی ژیریی ئەوەندە کەمتر

دەبێت، بە جۆرێکی ئەوتۆ شیکرنەوەی ڕاستەوخۆی بۆ واتای شتەکان لە دەستدەدات.

توێژەران - بە پێچەوانەوەی پێشبینیی باوان - ئاماژە بەوە دەکەن دەکرێت ئامێری مۆبایل و جۆرەکانی تر کاریگەرییان هەبێت لەسەر کەمکردنەوەی زیرەکی و داهێنان لای منداڵ، بەجۆرێك لەو ئامێرانەدا وەڵامی ئامادەکراو هەن و بە یەك کلیك دێنە سەر شاشە، کە ئەمەیش کاریگەریی لەسەر گەشەی سۆز و دەروونی منداڵ دەبێت، سنوور بۆ داهێنان و بیرکردنەوە لە هەمبەر چارەسەری کێشەکان بە شێوەیەکی بەرنامەبۆدارێژراو دادەنێت.

سەرباری ئەمەیش، بوونی کەناڵی ئاسمانی و ئینتەرنێت بەو ڕۆشنبیرییە جۆراوجۆرەی لەخۆیانیان گرتووە، کە باش و خراپ و چروك و گرانبەهایان تێکەڵ کردووە" ترس هەیە کاریگەرییان لەسەر زۆرێك لەو بەها و بنەمایانە هەبێت، کە ڕۆڵەی وڵاتی موسڵمانان لەسەری پەروەردە دەبن.

بۆیە پێویستە توێژەر و پەروەردەکاران بایەخ بە پرسی خۆچاودێریکردن لە تەمەنی بچووکییەوە بدەن و گەشەی پێ بدەن، چونکە هەر ئەمە بەرپرسیارە لە بەرگریکردن لە بنەما و ڕەوشت و

ڕەفتاریان، سەرباری ئەوەی بە تەواوی بڕوایانەوە دەستی پێوە بگرن.

کاتێك ئێمە منداڵەکانمان قووڵ دەکەینــەوە لــەناو خۆشەویســتیی خوا و ملکەچبوون بۆی و بــۆ پێغەمبەرەکــەی ﷺ، هــەروەها فێــری حەقیقــەتی باوەڕیــان دەکــەین، ئــەوکات لەســەر هەســتکردن بــە چاودێریکردنی پەروەردگار بۆ هەموو شتێکی بچووك و گەورە و ترس لێی پەروەردە دەبن، خۆیان بەدووردەگرن لە خراپەکاریی کۆمەڵایەتی و وەسوەسەی دەروونی و بەدکاریی ڕەوشتی.

لێرەدا دڵخۆشم، کە دەڵێم: بەڕاستی خاتوونی توێــژەر، (نــورة)ی کچی (مسفر القرني) لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتە سەرکەوتوو بووە، کە تێیدا لێکۆڵینەوەی لە دیاردەیەکی گرنگی کۆمەڵگە کردووە، بەڵکو من پێموایە لەبــەر مەترســیی زۆری ئــەم بابەتــە و بڵاوبوونــەوەی و قووڵیی کاریگەرییەکەی پێویستی بــە توێژینــەوەی زیــاتر هەیــە لــە هۆکــار و چارەســەرەییەکان، کــە ئــەم کــارە بــۆ گەشــەپێدانی خۆچاودێریکردن لای منداڵ" یارمەتیی پەروەردەکاران و کۆمەڵگــەی خێزانی دەدات.

لە پەروەردگار دەپاڕێمەوە سەرکەوتنی زیــاتری پــێ بەخشــێت و هەوڵ و ماندووبوونی سوودبەخش بێت.

وصلى الله على سيدنا محمد، وعلى آل وصحبه أجمعين، وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

**د. الجوهر بن سليمان السليم**
**بەڕێوەبەری کارگێڕیی گشتی بۆ توێژینەوەی پەروەردەیی**
**لە وەزارەتی پەروەردە و فێرکردنی پێشوو**
**٢٠١٨/٢/١٦م**

# پێشەکی...

هەرگیز جیهان وەکو ئێستا پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای بەم شێوەیە بەخۆیەوە نەبینیوە، ئەمەیش لە دەرئەنجامی شۆڕشی تەکنەلۆژیا و کرانەوەیەکی ئێجگار گەورەدا ڕوویداوە، تا وای لێ هاتووە دونیا بووەتە گوندێکی بچووك و کودەتایەکی گەورەی لە بواری بەهاکان بەرپا کردووە و گۆڕانکاریی لە چەمکەکاندا کردووە، ئەمەیش ڕەنگدانەوەی لەسەر کۆمەڵگە بە گشتی و خێزان بەتایبەت هەیە. ئەم تەکنەلۆژیایە بووەتە بەشێکی دانەبڕاو لە ژیانمان، بەڵکو لە ژیانی ڕۆژانەمان، وای لێ هاتووە دەستخستنی ئاسان بێت، منداڵ وەك گەوران هەڵیدەگرێت. ناتوانین نکوولی لە لایەنە ئەرێنییەکانی تەکنەلۆژیا بکەین، بەوپێیەی بووەتە سەرچاوەیەکی هەرە گرنگ لە سەرچاوەکانی زانیاری و ئامرازی فێرکردنی منداڵان، بووەتە هۆیەك بۆ کاتبەسەربردن و چێژوەرگرتنیان، بەڵام ڕووتێکردنی منداڵان بۆ ئەم ئامێرانە وای کردووە کێشە و گرفت لە زۆربەی بوارەکاندا دروست ببێت. لێرەدا بەرپرسیارێتیی خێزان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کێشانە زیاتر دەبێت، ئەمانەتی پەروەردەکردنی منداڵانی و ئامادەکردنیانیان لە ڕووی دەروونی و ڕۆحییەوە کەوتووەتە سەر، کە ڕۆڵی خێزان بۆ هەموو پێشکەوتن و پێشخستنێك جێگەی ئومێدە. لە بەرزترین

ئەرکە پەروەردەییەکان، کە کەوتووەتە سەر شانی خێزان و پێویستە پێی هەڵبستێت بریتییە لە: چاندنی بیری خۆچاودێریکردن و بەهێزکردنی لە لای منداڵ، ئەم کارەیش سەرەتا بە پشتبەستن بە خوای پەروەردگار دەبێت، پاشان بەکارهێنانی تەواوی هۆکارەکان، کە دەمانگەیەننە ئامانج...

ئاراستەکردن و پەروەردەکردنی خێزان ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە دارشتنی کەسایەتیی منداڵ و پێدانی تایبەتمەندی باش پێی، کە لە بنیادنانی کەسایەتییەکەیدا یارمەتیی دەدات.

لێرەدا بەتایبەتی مەبەستمان بەهای خۆچاودێریکردنە، کە بە هەستێکی هەڵقوڵاو لە ناخەوە ئەژمار دەکرێت، وەك دەسەڵاتی ناوەوە وایە، ویژدان تێیدا بەئاگا دەبێت" هەستکردن بە ڕێزگرتن و پابەندبوون و بەرپرسیارێتی لە لای قووڵ دەبێتەوە بەبێ پێویستی بوون بە چاودێریی دەرەکی، لە کۆتاییدا ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە ڕێکخستنی ڕەفتارەکانی و ئاراستەکردنی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست.

جا ئەگەر ئەم بەهایە لە لای منداڵ چێنرا و لە دەروونیدا گەشەی کرد، ئەوکات سەرپێچیکردن و خۆلێگێلکردنی ئەستەم دەبێت، هێڵی یەکەمی بەرگری و کانیاوی سەرەکییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕووداوە یەك لە دوای یەکەکانی کۆمەڵگەدا. بۆیە، تا ئەو جۆرە چاودێرییە لە لای منداڵ بەهێزتر بێت، زیاتر بە شێوەیەکی ئەرێنی ئاوێتەی

کۆمەڵگە دەبێت، ئەمەیش لە ڕوانگەی ئەو باوەڕەی لە ناخیدایە، کە پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەوەی ببێتە کەسێکی بەسوود بۆ خۆی و دەوروبەری.

**ئەم کتێبە دابەشکراوە بۆ سێ بەش:**

- بەشی یەکەم، کە بە شێوەی زارەکییە، دوو لایەن دەگرێتەوە:

– **یەکەم: خۆچاودێریکردن،** کە چەندین شێواز بۆ بە هێزکردنی چاودێریکردنەکە لەخۆدەگرێت، لەگەڵ بوونی ئاستەنگەکان و ڕێگەکانی زاڵبوون بەسەریدا، کە - بە پشتیوانیی خوا - لە بواری بەهێزکردنی خۆچاودێریکردنی منداڵدا یارمەتیی پەروەردەکار دەدات.

– **دووەم: تایبەتمەندییەکانی قۆناغی منداڵی،** کە تێیدا هەندێك تایبەتمەندی هۆشی و هەڵچوون و کۆمەڵایەتیی منداڵ لەخۆدەگرێت، کە - بە پشتیوانیی خوا - یارمەتیی پەروەردەکار دەدات بۆ زیاتر ئاشنابوونی بە منداڵەکەی.

- **بەڵام بەشی دووەم:** بریتییە لە کۆمەڵە چالاکییەکی جۆراوجۆر، کە دەکرێت بۆ بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن لای منداڵ بەکاربهێنرێن.

- **سەبارەت بە بەشی سێیەم:** کۆمەڵە پرسیار و کێشە و گرفتێکن، کە لەلایەن دایکانەوە بۆم هاتوون کاتێك هەولیان داوە خۆچاودێریکردن لای منداڵ بەهێز بکەن، منیش بەو زانیارییانەی

خوای گەورە پێیداوم وەڵامم داونەتەوە، ئەگەر ڕاستم کردبێت ئەمە لە لایەن خواوەیە و سوپاس و ستاییش بۆ خۆی" خۆ ئەگەر هەڵەیشم کردبێت، ئەوا لە خۆم و شەیتانەوەیە.

لە خوا دەپاڕێمەوە ئەم هەوڵە سادەیەم سوودبەخش بێت و بەرەکەتی تێ بخات، بیکاتە کارێکی دڵسۆزانە بۆ زاتی خۆی، سوپاس و ستاییش بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

**نورة بنت مسفر سعد القرني**
**ماستەر لە پەروەردە و ڕێنمایی پەروەدەیی**
**جەددە / ١٣ی جەمادی یەکەمی ١٤٣٩ی کۆچی**

# بەشی یەکەم

## یەکەم: خۆچاودێریکردن:

کۆمەڵگــەی هاوچــەرخی موســڵمانان لــە ڕووی قــوولایی و ئاراستەکان و دەرئەنجامەکان، گۆڕانکاریی فراوان و گەورە بەخۆیــەوە دەبینێــت، ســەرباری پێشــکەوتنی سەرســووڕهێنەری هۆیــەکانی پەیوەندیبەستنی سەردەمییانە (تەکنەلۆژیا)، کـە سـنووری کـات و شوێنی و کلتووری تێپەڕاندووە، بە کۆمەڵێك ئاڵنگارییەوە هاتووەتە مەیدان. ئـەم تەکنەلۆژیایـە - بـە زەبـەلاحیی خۆیـەوە - هـەڵگری سیستمێکی ڕۆشنبیری و زانیاری و فیکری و سیاسی و ئابوورییە، کە کاریگەریی گەورەی هەیە لـە دروسـتکردنی ململانێـی نێـوان بـەها ڕەســەنەکان و بــەها هاوچــەرخەکان، لەگەڵیــدا کێشــەی گــەورە ســەرهەڵدەدات، بــۆ نموونــە: شــڵەژان و شــپرزەیی، هاوســەنگی لەدەسـتدان، خـراپ گونجـانی کۆمەڵایـەتی، یـاخیبوون لـە بـەها و دابونەریتەکانی کۆمەڵگە، بەزاندنی هێڵە سوورەکان بۆ گەیشـتن بـە بیروباوەڕە چەسپیووەکان، لادانی ڕەفتاری و ڕەوشتی. بۆیە بـێ هـیچ گومانێك پێویستە خۆچاودێریکردن لە لای منداڵ هەبێت، بۆ ئـەوەی

بەرەو ڕێگەیەکی باش ڕێنوێنیی بکات و لە خراپـە دووری بخاتـەوە، هەروەها بۆی بیبێتە هێزێکی ناوخۆیی، کە پێویستی بە ئاراستەکردن و لێپرسینەوەی دەرەکی نەبێت.[١]

کەواتە خۆچاودێریکردن چییە و گرنگییەکـەی چـییە؟ چـۆن لای منداڵ بەهێز دەبێت؟

## • چەمکی خۆچاودێریکردن:

بریتییە لە هەستێکی ناوخۆیی و ڕێکخەری منداڵ، لە باوەڕبوون بە بوونی چاودێریی خـوای گـەورە و ئاگـابوون لـە کردەوەکانییـەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم هەستە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەنـدیی خـوای گـەورە، داوای لـێ دەکـات سـووربێت لەسـەر کـاری چـاکە، بـۆ خۆپاراستنیش لە سزاکەی، خۆی لە خراپە بەدوور بگرێت" لە ئاکامدا منداڵ پابەند دەبێت بە لێپرسینەوەی بـەردەوام لـە خـۆی، ئـەوکات لایـەنی ئاشـکرا و پـەنهانی چـوونیەك دەبێـت و لەگـەڵ بـەها ڕەوشتییەکان و پێوەرە ئیسلامییەکاندا گونجاو دەبێت.

---

[١] الرقابة الذاتية وعلاقتها بالقيم الاجتماعية (ص ٤).

## • گرنگیی خۆچاودێریکردن:

لە ژێر سایەی ئـەو کرانـەوە تەکنـەلۆژیا و پێشـکەوتنەی، کـە ئەمڕۆ هەیە، هەروەها لەگەڵ باڵادەستبوونی هۆیەکانی ڕاگەیانـدن و شۆڕشی پەیوەندییەکان، گرنگیی خۆچاودێریکردن زیاتر دەردەکەوێت. ئـەم بارودۆخـە وای کـردووە بـەهۆی دەرئـەنجامی ململانێـی نێـوان دەسـتبەرداربوون لـە بـەها ئیسـلامییەکان و پارێزگاریلێکردنیـان، جۆرێك لە شپرزەیی و پشێوی لە لای تاك دروست ببێت. با ئەوە لـە بیر نەکەین، کە ئەم کرانەوەیە سـوودی زۆری هەیـە، لەوانـە: ئاسـان دەستگەیشتن بە زانیارییـەکان و کرانـەوەی دەرگـای زانسـت لەسـەر پشت، بەڵام - بەهۆی خراپ بەکارهێنانیان و نەبوونی ئامۆژگاریکار و پـەروەردەکار - ئـەم شـەپۆلە گۆڕانکارییـە هـاوڕێ بـووە لەگـەڵ کۆمەڵێك نیشانەی ترسناك، کە لە تواناياندایە ئەم تەکنەلۆژیایە بـۆ سـزا و تـووڕەیی سـەرەونخوون بکەنـەوە، بەتایبـەت کاتێـك دەبێتـە هۆکاری ڕووخـانی بـەها پـەروەردەیی و ڕەوشـتییە ئیسـلامییەکان، ئەوکات چەمکەکان دەگۆڕێن و شـوێنەواری دەروونـی و ڕەفتـاری و کۆمەڵایـەتی لەسـەر منـداڵ جێـدەهێڵێت، کـە لەوانەیـە جیهـانی بێگەردی منداڵ ئاوێتـەی تاوانکـاری ببێـت، کـە بەدڵنیایـەوە ئـەم دیاردەیە لە هەندێ لە وڵاتان زۆر ترسناك بووە و پـەرەی سـەندووە و پێویستی بە دەستوەردانی خێـرا هەیـە بـۆ چارەسـەرکردنی. لێـرەدا ئەرکـە لەسـەر هـەموو پـەروەردەکاران گرنگـی بـە چـاندنی بـیری خۆچاودێریکردن و بـەهێزکردنی بـدەن لـە لای منـداڵ لـە تەمـەنی

زووەوە، چونکە ئەم تەمەنە مەترسیدار و یەکلاکەرەوەیە بۆ دروستبوونی هۆشیاریی ڕەوشتی لای منداڵ، کە وا لە منداڵ دەکات بتوانێت باش و خراپ لە یەك جیابکاتەوە. هەرشتێکیش لەم تەمەن و قۆناغەدا لای منداڵ دروست ببێت، لە تەمەن و قۆناغی دواتردا لابردن و گۆڕینی ئەستەم دەبێت!

ئەوکات منداڵەکە دەبێتە چاودێر بەسەر خودی خۆی و بەسەر زمان و سەرجەم ئەندامەکانییەوە، بەبێ پێویستبوون بە لێپرسینەوەی دەرەکی، بۆ خۆی لێپرسینەوە لە خۆی و کار و کردەوەکانی دەکات، بەربەرەکانێ لەگەڵ ئارەزووەکانی دەکات" هەرشتێك زیان بەو ئاداب و بنەما ئیسلامییانە بگەیەنێت، کە لەسەریان گەورە بووە، خۆی بەدوور دەگرێت لێیان. هەر کاتێکیش خۆچاودێریکردن لە لای دروست بوو، ئەوکات سووردەبێت لەسەر ئەنجامدانی کاری چاکە، هەوڵ دەدات کارەکان بە ڕێکوپێکی ئەنجام بدات" ئیتر ئەگەر کارەکە دونیایی بێت، یاخود دینی، بەگوێرەی فەرمایشتی پەروەردگار، کە دەفەرموێت: ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ (البقرة: ١٩٥).

واتە: "هەمیشە خێر و چاکە ئەنجام بدەن و چاکەخواز بن، چونکە بەڕاستی خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت"، سوورە لەسەر ئەوەی ئەرك و بەرپرسیارێتییەکان لەگەڵ یەکتر بسازێنێت و بیانگونجێنێت، باشترینی کارەکان دەکات و چاوەڕێی پاداشتی خوای پەروەردگار دەبێت لە دونیا و ئاخیرەدا" ئەوکات لە ئۆقرەیی و ئارامیدا دەژی، گەر هەڵەیشی کرد داوای لێخۆشبوون دەکات و دەگەڕێتەوە،

ئەمەیش وەك جێبەجێكردنی فەرمانی خوای موتــەعال: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ ﴾ (الزمــــــر: ٥٣).

واتە: "(ئەی پێغەمبــەر!) پێیــان بڵــێ: خــوا دەفــەرموێت: ئــەی بەندەكانم! ئەوانەی كــە خۆتــان گوناهبــار كــردووە و هەڵــەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونكە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بكەن، ئەوە خوا لەهەر هەموو گوناهـ و هەڵەكانتان خۆش دەبێت".

## • ئەو هۆكارانەی یارمەتیی خۆچاودێریكردن دەدەن:

١- لەمیانەی شیكردنەوەی ئەم ناوە پیرۆزانــەی خــوای گــەورە (العلــیم - زانــا، الســمیع - بیســەر، البصــیر - بینــەر، الرقیــب - چاودێر) منــداڵ هەســت بــە (لەگــەڵبوون)ی خــوا و چــاودێریكردنی دەكات. هەركەسێك ناوەكــانی خــوای پــەروەردگار بناســێت و واتــا ڕاستەقینەكانیان تێبگات، ئەوكات بە ڕێگەی مەدح و ســەناكردن و پیرۆزكردن و بەگەورەزانینی، ئەو زاتە دەناسێت و هەست بە نزیكی و لەگەڵبوونی خوا دەكات.

### – (العلیم) زانا:

ئەو زاتەیە، كە زانستەكەی دەوری هەموو شتێكی دیار و نادیار

و ئاشكرا و پەنهانی داوە، جیهانی سەرەوە و خوارەوە، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، هیچ شتێكی لێ ون نابێت، بە زانست و زانیارییەكەی گەمارۆی هەموو شتێكی داوە، هەموو شتێكی لای ئەو زاتە بە ژمارە ئەژمار كراوە.[1]

(ابن القيم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی ئەوە دەكات، كە خوای پەروەردگار: "زانایە بە هەموو شتێك، بەهۆی كەماڵی زانستەكەیەوە بە هەموو شتێكی خەڵك بە ئاشكرایی و شاراوەییان دەزانێت، گەڵایەك ناكەوێت، مەگەر بە ئاگاداری ئەو نەبێت، هیچ گەردیەلەیەك جووڵە ناكات مەگەر بە ویستی ئەو نەبێت".[2]

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ (الأنعام: ٨٠)

واتە: "زانست و زانیاریی پەروەردگارم هەموو شتێكی گرتۆتەوە، ئایا ئەوە بیرناكەنەوە و یاداوەری وەرناگرن؟"

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴾ (غافر: ٧)

واتە: "پەروەردگارا! ڕەحمەت و میهرەبانیی تۆ، زانست و زانیاریی تۆ، هەموو شتێكی گرتووەتەوە".

---

[1] فقه الأسماء الحسنى (ص ١٣٤).

[2] سەیری (شرح ابن القيم لأسماء الله الحسنى) بكە (لا ٧٨).

جا کاتێك منداڵ لە زانستی خوای پەروەردگار تێگەیشت و زانیی هیچ شتێك لە کار و کردەوەکانی لە لا ون نابێت و چاودێرییان دەکات، ئەوکات هەوڵ دەدات هیچ شتێکی پێچەوانەی فەرمانی خوا ئەنجام نەدات، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (آل عمران: ٢٩)

واتە: "پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوەی لە سینەتاندا جێگیرە بیشارنەوە، یاخود ئاشکرای بکەن، ئەوە خوا پێی دەزانێت، هەرچییش لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر پێیان دەزانێت و خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە".

- (السميع) بیسەر:

ئەو زاتەیە گوێبیستی سەرجەم دەنگەکانە، دەنگی هیچکام لە دروستکراوەکانی لێ تێکەڵ نابێت، گوێبیستنی بۆ دەنگێك سەرقاڵی ناکات لەوەی ئاگای لە دەنگێکی تر نەبێت" سەرباری جۆراوجۆریی دەنگەکان و بەرزونزمییان هەر دەیانبیستێت[1]، قسەی ئاشکرا و پەنهان لای ئەو چوونیەکە، وەك دەفەرموێت: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾ (الرعد: ١٠)

واتە: "ئەگەر کەسێکتان قسە بشارێتەوە، یان بیڵێت و ئاشکرای

---

[1] سەیری (شرح ابن القيم لأسماء الله الحسنى) بکە، (لا ٨٠).

بکات، چوونیەکە لای ئەو زاتە" هەروەها ئاگاداری ئەو کەسەیە، کە لە تاریکیی شەودا خۆی دەشارێتەوە، ئەوەیشی، کە بە ڕۆژدا دەڕوات و ئاشکراو دیارە".

پێشەوا ئەحمەد لە خاتوو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە، کە دەفەرموێت: (سوپاس بۆ خوای گەورە، کە بیستنی بۆ هەموو دەنگێك فراوان بووە، ئافرەتێکی وتووێژکار هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و قسەی لەگەڵ دەکرد، منیش لە سووچێکی ماڵەوە بووم، گوێم لە قسەکانیان نەبوو، خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ (المجادلة: ١)

واتە: "(ئەی محمد!) بێگومان خوا بیستی و وەریگرت وتووێژی ئەو ئافرەتەی، کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، سکالای خۆیشی بۆ لای خوا دەبات، خوایش گوێی لە گفتوگۆکەتان بوو، بەڕاستی خوا بیسەر و بینایە".

دەرکپێکردنی منداڵ بەوەی خوای گەورە بیسەرە، ئەوا هەستی پاراستنی زمان و باشکردنی قسەکانیی پێدەبەخشێت، وای لێ دەکات بەردەوام بێت لە یادکردنی خوا و سوپاسکردنی، بەڵکو ڕازونیاز و پاڕانەی زیاتر دەبێت. زۆرترین پاڕانەوەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) بەم ناوە پیرۆزە بووە، ناوی (السمیع - بیسەر)، وەك ئیبراهیم و ئیسماعیل عليه السلام دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ

ﭐلسَّمِيعُ ﭐلْعَلِيمُ ﴾ (البقرة: ١٢٧)

واتــە: "پــەروەردگارا! ئــەم کارەمــان لــێ وەربگــرە و لــە ڕیــزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی زۆر بیسەر و زانایت".

پەروەردگار فەرمانمان پێ دەکات لە کاتی تووشبوون بە وەسوەسە و خەتوورە و خەیاڵی شەیتان داوای یارمەتی لەو بکەین و پەنای پێ بگرین، وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ﭐلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَﭑسْتَعِذْ بِﭑللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ﭐلسَّمِيعُ ﭐلْعَلِيمُ ﴾ (فصلت: ٣٦)

- **(البصير) بینەر:**

هەر ئەو زاتە پــاك و بێگەردەیــە، کــە مێرولەیــەکی ڕەش لــە شەوێکی تاریك و ئەنگوستەچاودا دەبینێت، جا لە دەشت بێت، یــان لە شاخ. بینەر ئەو زاتەیە لە ژێر حەوت چینی زەویدا شت دەبینێت، وەك چۆن لە سەرووی حــەوت ئاسمانانــەوە دەبینێــت.[١] پــەروەردگار دەفەرمــوێت: ﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ﭐللَّهَ يَرَىٰ ﴾ (العلق: ١٤)

واتە: "ئایا نازانێت، کە خوای گەورە بەدڵنیاییەوە دەیبینێت؟"

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ﭐلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ﭐلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ﭐللَّهِ ۗ إِنَّ ﭐللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (البقرة: ١١٠)

ئەم ئایەتە بەڵێنێکی لە لای خوای مەزنەوە تێدایە، بــەوەی ئــەو

---

[١] سەیری (فقه الأسماء الحسنى) بکە (لا ١٢٩).

زاته هیچ شتێکی باوەڕدار بە زایە نادات، لەو کـردەوە باشـانەی بـۆ خۆی کردوون، بەدڵنیاییەوە بینەرە پێیان و لەسـەر ئـەم کردەوانـەیش پاداشتی گەورەیان دەداتەوە.

ئەگـەر منـداڵ هەسـتی کـرد خـوای گـەورە بینـەرە پێـی و ئاگادارییـەتی، ئـەوکات لێـی دەپارێتـەوە، بـۆ ئـەوەی بـە جـوانی بیپەرستێت، هەروەك چۆن لێـی دەپارێتـەوە، بـۆ ئـەوەی لـە خراپـە دووری بخاتـەوە" ئەمـەیش پلـە و پایـەی چـاکەیە (الاحسـان)، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**چاکە بریتییە لەوەی خوا بپەرستی وەك ئەوەی دەیبینیت، گەر تۆیش ئەو نـەیبینیت، بێگومـان ئـەو تـۆ دەبینێت**).[1]

– **(الرقیب) چاودێر:**

ئەو زاتە چاودێر و ئاگادارە بـەو شـتانەی لـە دڵ و دەروونـەکان شـاردراونەتەوە، ئاگـادارە بـە هەرکەسـێ، کـە چـیی کـردووە. دروستکراوەکان دەپارێزێت، بە جوانترین شێوە پاداشتیان دەداتـەوە، چاودێری شتە بینراوەکانە، هیچ شتێك لـە بینـینی ئـەو ون نابێـت" چاودێرە بە شـتە بیسـتراوەکان، توانـای بیسـتنیی هـەموو شـتێکی گرتووەتـەوە. بـە زانسـتەکەی، کـە دەوری هـەموو شـتێکی داوە،

[1] سەحیحی بوخاری، الایمان (٥٠).

ئاگاداری سەرجەم دروستکراوەکانییەتی.[١] پەروەردگار دەفەرموێت:
﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴾ (الأحزاب: ٥٢)

واتــە: "هەمیشــە و بــەردەوام خــوا چــاودێریی هــەموو شــتێك دەکات".

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ (النساء: ١)

(ئیبن کەسیر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت، واتە: "ئەو زاتــە چاودێری سەرجەم کار و کردەوە و بارودۆخەکانتانە".[٢]

جا ئەگەر منداڵ هەستی بــە (لەگــەڵبوونی) خــوا ﷻ کــرد بــە زانست و بیستنەکەی - لە حاڵێکدا ئەو لەسەر عەرشە پیرۆزەکەیەتی - بۆ هەر شوێنێك بچێت و لــە هــەر جێگەیــەك بێــت لەگەڵیدایــە" هەروەها چاودێرە لەسەری و ئاگاداری نهێنییەکانی دەروونیشییەتی، ئەوکات هێزی شەرمی لێ دروست دەبێــت، شــەرم دەکــات خــوا لــە حاڵێکدا ببینێت، کە پێی ناخۆشە، یاخود شــتێکی لــێ ببیســتێت، کە حەزی پێ ناکات" یان شتێك لە دڵیدا بشارێتەوە ئەو زاتە تــووڕە بکات، لە دەرئەنجامدا جووڵە و کــردەوە و ئەندێشــەکانی بــەگوێرەی تەرازووی شەرع دەبێت.[٣] فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات و خۆیشــی لە قەدەغەکراوەکانیش بەدووردەگرێت، ئەو سنوورە نابــەزێنێت، کــە

---

[١] فقه الأسماء الحسني، (لا ١٥٩).
[٢] شەرحی ناوی پیرۆزی (الرقیب)ی خوا، (محمد ویلالي) لە ماڵپەری (الألولكة).
[٣] شەرحی (ابن القیم) بۆ ناوە پیرۆزەکانی خوا (لا ٢٣).

فەرمانی پێ کردووە و ڕووخسەتی پێداوە، ئەم کارەیش بە پیرۆز سەیرکردنی خوا و شکۆ و ڕێزگرتنی ئەو زاتەی پێ دەبەخشێت" هەر ئەمەیشە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا ئامۆژگاری ئامۆزاکەی (عبداللە)ی کوڕی (عباس) ﷺ دەکات و پێی دەفەرموێت: **(ئەی لاو! من چەند وشەیەکت فێر دەکەم، ئاین و سنوورەکانی خوای گەورە بپارێزە، ئەویش دەتپارێزێت. ئاین و سنوورەکانی خوای گەورە بپارێزە، لە کاتی پێویستیدا خوای گەورە لە بەرامبەرتدا دەبینیت. ئەگەر پاڕایتەوە لە خوا بپاڕێرەوە، ئەگەر داوای پشتیوانیت کرد لە خوا داوا بکە. بیشزانە، ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، هیچ سوودت پێناگەیەنن مەگەر خوای گەورە بۆی نووسیبێت، خۆ ئەگەر هەموو خەڵکیش کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن، هیچ زیانت پێناگەیەنن مەگەر خوای گەورە بۆی نووسیبێت. قەڵەمەکان بەرزکرانەوە و پەڕاوەکانیش وشك بوونەوە)**.[1]

- **تێبینی:**

لەوانەیە کەسی پەروەردەکار ڕووبەڕووی هەندێك پرسیاری منداڵان ببێتەوە لەبارەی خوای پەروەردگار و بیستن و بینینی، یان لەوانەیە ئەو پرسیارە لە شێوەی وێنەی کێشراودا ئاراستەی بکرێتەوە، کە هاوشێوەی وێنەی چاو و گوێی مرۆڤ بێت! لێرەدا

[1] الرقابة الذاتية في عمل المحتسب (لا ٤٠).

پێویستە پەروەردەکار ئەم بابەتە پشتگوێ نەخات، بەڵکو دەبێت بۆ منداڵەکە ڕوون بکاتەوە، کە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ (الشورى: ١١)

واتە "هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت و هەر ئەویش بیسەر و بینایە".

ئینجا با بە منداڵەکە بڵێت: "خوا وەکو ئێمە نییە، هیچ شتێکیش وەك ئەو نییە، من و ئێوە و سەرجەم خەڵکی دروستکردووە، تەنانەت درەخت و دەریا و هەموو شتەکانی ئەم دونیایەی دروست کردووە. ئەو سەرچاوەی هێزە، ئەگەر بیەوێت شتێك بکات، بە شتەکە دەڵێت (ببە) ڕاستەوخۆ دەبێت. خوای پەروەردگار لە مرۆڤەکان جیایە، خوا قسە دەکات و دەبیستێت و دەبینێت، بەڵام نەك وەك بینین و قسەی ئێمە، چونکە خوا جیاوازە لە دروستکراوەکانی، ئەو زاتە هەموو شتێك دەبیستێت و هەموو شتێك دەبینێت، بەڵام بیستن و بینینی بە بیستن و بینینی دروستکراوەکانی ناچێت، چونکە هی دروستکراوەکان کەموکوڕی و لاوازیی تێدایە".[١]

**بۆ نموونە:** دەکرێت پەروەردەکار منداڵەکەی تێبگەیەنێت، کە ئەو بینینەی خوای گەورە پێی بەخشیووین، تواناکەی لاوازە و ناتوانێت زۆرێك لە شتەکان ببینێت، بۆیە دەبینین مرۆڤ ئامێری گەورەکردن و

---

[١] سەیری (اسئلة الأطفال الإيمانية) بکە (لا ١١٩، ١٢٧).

مایکرۆسکۆب بەکار دەهێنێت" ئەمە ئەگەر مـرۆڤ نـەتوانێت شـتی دروستکراو ببینێت ئەی چۆن دەتوانێـت خـوای بەدیهێنـەر ببینێـت! شتگەلێکی زۆر هەن ناتوانین بیانبینین، بەڵام بوونیشیان هەیە" ئێمـە دەنگ دەبیستین، کەچـی نـاتوانین بیبیـنین.. هـەوا نـابینین، کەچـی هەستی پێ دەکەین.. چاوەکانمان ناتوانن لـە دونیـادا خـوای گـەورە ببینن، کەچی لە بەهەشت - بـە ویسـتی خـوا – چـاوی ئـەوتۆمان دەبێت، کە لە توانایدا دەبێت ڕووی جوانی خوا ببینێت.[1]

## ٢- دانبەخۆگرتن و خۆکۆنترۆڵکردن:

توێژەران (دانبەخۆداگرتن) بە توانای مـرۆڤ پێناسـە دەکـەن لـە کـۆنترۆڵکردنی سـۆز و ڕەوشـت و ئارەزووەکانیـدا، بەتایبـەت لـەو بارودۆخە دژوارانەی پێویست دەکـات هەڵویسـتێك لـە بەرامبەریـدا بگیردرێتەبـەر، ئەمـەیش لـەپێناو بەدەسـتهێنانی (پاداشـت لـە داهاتوو)، بۆیە دانبـەخۆداگرتن خـۆی لـە توانـای (بـەڕێوەبردنێکی چـالاکانە بـۆ داهـاتوو)دا دەبینێتـەوە.[2] تـا ئـەم جـۆرە توانـای دانبەخۆداگرتنـەیش لای منـداڵ زیـاتر بێـت، زیـاتر پێویسـتی بـە کۆنترۆڵکردنی دەرەکی نابێت، کە لەسەرچاوەی دەرەکییەوە بۆی بێت، بەم شێوەیە دەبێتە چاودێر بەسەر ڕەفتارەکانی خۆیەوە، چاودێرییەکی ئەوتۆ، کە لە ناخیدا هەڵدەقوڵێت.[3]

---

[1] سەیری ( أسئلة الأطفال الإيمانية) بکە، (لا ١٣١).

[2] سەیری (الطفل على ضبط النفس، أحمد خضر) بکە، لە ماڵپەری (الألوكة).

[3] سەیری (أبناؤنا في مرحلة البلوغ) بکە، (لا ٥٩).

ڕاهێنان لەسەر کارامەیی (دانبەخۆداگرتن) لـە سـاڵەکانی زووی منداڵیدا دەست پێ دەکات، بەوپێیەی منداڵ لەو تەمەنەدا بەتەواوی پشت بە دەوروبەری دەبەستێت. منـداڵ لەسـەر بنـەمای پەیوەنـدیی خۆی لەگەڵ پەروەردەکار (دایك یان بـاوك)، ئـەو ماددەیـە دروسـت دەکات، کە دەتوانێـت بـە هۆیـەوە بیروبۆچـوون و ڕەفتـار و سـۆز و ئەندێشەکانی لە داهاتوودا ڕێـك بخـات، بۆیـە دەبێـت پـەروەردەکار نموونەیەکی پێشەنگ بێت بۆ منداڵەکەی، کە لەسەر دانبـەخۆداگرتن و جێبەجێکردنی فەرمانـەکانی خـوا و نـەکردنی قەدەغـەکراوەکانی ڕایبهێنێت" ئەم کارەیش نایەتەدی، مەگـەر بـە ڕاهێنـان و ڕاهـاتن بەشێنەیی، کە بەهۆی فێرکردن و چاودێرییەوە پەروەردە دەبێت. جـا ئەگەر هێزی دانبەخۆداگرتنی لا بەهێز بوو، زۆر کاری جـوان و بـاش ئەنجام دەدات و خۆیشی لە کاری خراپـە و ناشـیرین دووردەخاتـەوە، بەڵام ئەگەر ئەم هێزە لە کار کەوت و بەکارنەهات، لە ئاکامدا حـەز و ئارەزووەکان ئازاد دەبن و هیچ ڕێکخـەرێکیش بـوونی نامێنێـت و خاوەنەکـەی دەگەیەنێتـە سـەرئەنجامێکی ئـەوتۆ هـەرگیز بەرگـەی ناگرێت.[1]

ئەمانـــەی خـــوارەوە چـــەند جـــۆرێکن لـــە شـــێوازەکانی (**دانبەخۆداگرتن**)، کە منداڵ لەسەریان ڕادەهێنرێت:

– ڕاهێنـانی لەسـەر دانبـەخۆداگرتن و ئـارامگرتن لەسـەر

---

[1] سەیری (ضبط النفس في التربية الإسلامية) بکە، (لا ٣٢).

فەرمانەکانی خوا، وەك: نوێژ و ڕۆژوو و چاکە لەگەڵ دایك و باوك.

- ڕاهێنانی لەسەر ئەو قەدەغەکراوانەی خوای گەورە ڕێگریی لێ کردوون، وەك: کار و گوفتار (غەیبەت، فەسادی، بوختان و...هتد)

- ڕاهێنانی لەسەر ڕەوشتە بەرزەکان، وەك: دەستگرتن بە هەموو جۆرە ڕەوشتێکی جوانەوە، کە موسڵمان لەگەڵ براکەیدا مامەڵەی پێوە دەکات لە چەشنی ڕاستگۆیی، دەستپاکی، ڕێزگرتن، بەردەوامبوون لەسەریان و بەرەوپێشبردنیان" هەروەها وازهێنان لە هەر شتێ، کە نەرێنییە و دژیەکە لەگەڵی.[١] ئەمە جگە لە زاڵبوون بەسەر ڕەفتارە خۆرسکەکاندا، وەك: زاڵبوون بەسەر تووڕەیی، لە بەرامبەردا خواردنەوەی تووڕەیی و وەڵامدانەوەی چاکە بە خراپە.[٢]

## ٣- هەڵبژاردنی هاوڕێی باش:

بوونی هاوڕێ لە نیشانە دیارەکانی پێشکەوتنی منداڵە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و دەروونییەوە. منداڵ، تا گەورەتر بێت بۆ تێرکردنی زۆرێك لە پێویستییەکان وەك هاوسەنگیی خودی، هەستکردنی بە بوونی ئینتیما و گەشەکردنی لایەنی سۆزداری و زمانەوانی و کۆمەڵایەتی، پێویستی بە هاوڕێ هەیە. هاوڕێیەتی لەسەر چەند

[١] سەیری (ضبط النفس في التربية الإسلامية) بکە، (لا ٧٤).
[٢] سەیری (دور الرقابة الذاتية، ياسر بكار) بکە، لە ماڵپەری (الألوكة).

بنەمایەك دروست دەبێت، لەوانە: قـەبووڵکردن، ڕەزامەنـدی، پشـت بەیەکتر بەستن، ڕێککەوتن لەسەر بەها و بیروباوەڕەکان، سەرسـامیی هاوبەش بە پاڵـەوانان و... هتـد. بۆیـە هەڵبـژاردنی هـاوڕێی بـاش کاریگــەریی لەســەر کەســایەتیی هاوڕێکــەی دەبێــت، وەك لــە فەرموودەدا هاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**نموونەی هاوڕێی باش و هاوڕێی خراپ وەك نموونەی فرۆشیاری میسك و ئاسنگەری کوورەی ئاگر وایە" فرۆشیاری میسك یان بۆنت پێ دەدات، یان لێی دەکڕیت، یان بۆنی خۆشـی لـێ دەکـەیت، بـەڵام ئاسـنگەر" یـان پۆشاکەکەت دەسووتێنێت، یان بۆنێکی ناخۆشی لێ دەکەیت**).[1]

ئەم فەرموودەیە گـەورەیی هـاوڕێی بـاش دەردەخـات، کـە وەك فرۆشیاری میسك وەسفی دەکات، بەوپێیـەی هـاوڕێ دەبێـت ببێتـە پشتوپەنا بۆ هاوڕێکـەی، ئەگـەر پێویسـتی پێـی هـەبوو" هـەروها هەرچی لە توانایدا هەیە لە ماڵ و سامان و کاتی خۆی بـۆی سـەرف بکات، هاوبەشیی خەم و کێشەکانی بکات و دڵنـەوایی بکـات، لـە کاتی خۆشیدا بەشداریی دڵخۆشییەکانی بکات" ڕێنوێنیی هاوڕێکەی بکات بۆ پەرستن و بەندایەتی، تەنانەت دەستی بگرێت بۆ ئەم کـارە، گەر چالاك بوو بەشدار بێت لەگـەڵی، گـەر کەموکوڕییشـی هـەبێت بــەیادی بهێنێتــەوە. هــەرگیز غەیبــەتی هاوڕێکــەی نــەکات، نهێنییەکانی ئاشکرا نەکات، بەگوێرەی توانـا هاوکـاریی پێشـکەش بکـات، گـەر قـەرزی لـێ وەرگـرت ئـارامی لەسـەر بگرێـت" گـەر

---

[1] سەحیحی موسلیم (٢٦٢٨).

كەموكوڕییەكی بەرامبەر دایك و باوكی لێ ببینێت، بێدەنگ نەبێت - بۆ نموونە - بەردەوام چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوكی و پەیوەندیی خزمایەتیی بە بیر بهێنێتەوە، لەپێناو خزمەتكردنی ئـایین و ئومـەت هانی بدات بۆ خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامەی بـەرز، لـە بـەڵا و ناخۆشیدا سەرەخۆشیی لێ بكات و ئۆمێدی لە لا دروست بكات.

ئەگەر كەسێك ئەمە سیفەتەكانی بـوو، ئـەوا هاوڕێیـەتیی ئـەم كەسە باشترین جۆری هاوڕێیەتی دەبێت، وەك (ابـن القـیم) دەڵێـت: "وەك ئەو خۆراكە وایە، كە هەر دەبێت بوونی هەبێت"[(١)]

### ٤- پاراستنی كات و بایەخپێدانی:

كات ژیانی مرۆڤە، تاكە كاڵای بێهاوتایـە بـە هـەموو خـەڵكی دراوە، بۆیە پێویستە بیپارێزین و بایەخی پێ بدەین، ئا ئەمەیە، كـە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردووین و دەفەرموێت: **(لـە ڕۆژی دواییدا بەندە هەنگاو هەڵناهێنێتەوە، تا پرسیار لەبارەی تەمەنی لێ نەكرێت لە چیدا سەرفی كردووە، لەبارەی زانستەكەی لە چیدا بەكاری هێناوە، لەبارەی ماڵ و سامانەی چۆن بەدەستی هێناوە و لە چیدا بەخشیویەتی، لە بارەی جەستەیەوە لە چیدا بەكاری هێناوە).**[(٢)] ئەم فەرموودەیە ڕوونی دەكاتەوە، كە كات بەرپرسیارێتییەكی گەورەیە و پێویسـتە كەسـی موسـڵمان بیپارێزێـت، لـە ڕۆژی دواییشـدا

---

[(١)] سەیری (صدیقي الصالح أن مشروعي، أمیرة محمود) بكە لە ماڵپەری (الألوكة).

[(٢)] الترمذي (٢٤١٧).

لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەری. ئەو بەندایەتییانەی خوای گەورە لەسەری فەرز کردووین، بە کاتی دیاریکراو بەستراونەتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴾ (النساء: ١٠٣)

واتە: "بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزە و دەبێت لە کاتی دیاریکراودا ئەنجام بدرێت". لەبەر ئەوەی کات وەك سامانە، بۆیە هەردووکیان (کات و سامان) پێویستە بپارێزرێن و لە سەرفکردنیان زیادەڕۆیی نەکرێت، بەڵام سامان بەوە لە کات جیا دەکرێتەوە، کە دەتوانرێت کۆبکرێتەوە و لە شوێنێك دابکرێت و گەشەی پێ بدرێت، بەپێچەوانەی کات، کە هەر چرکە و خولەکێکی بڕوات هەرگیز ناگەڕێتەوە. بۆیە لەسەر هەموو کەس پێویستە بە باشترین شێوە بەکاری بهێنێت و زیادەڕۆیی بە کەم و زۆرییەوە نەکات، بزانێت لە چیدا بەسەری دەبات؟ چۆن بەسەری دەبات؟ باشترین کارێك بۆ مرۆڤ، کە بتوانێت کاتەکانی تێدا بەسەر ببات بەندایەتی و پەرستنی خوای بەرز و بێهاوتایە، هەر کاتێك لەم بوارەدا سەرف بکرێت، هەرگیز لێی پەشیمان نابیتەوە. هەر بۆیە پێویستە لەسەر کەسی پەروەردەکار منداڵەکەی فێر بکات - هەر لەتەمەنی زووەوە - ڕێز لە کاتەکانی پەرستن، نانخواردن، نووستن، یاریکردن و کاتەکانی خوێندن بگرێت" لەگەڵ ئەوەیشدا دەکرێت بە باشە سوود لە ئامێرەکانی تەکنەلۆژیا وەربگیرێت بۆ ڕێنیشاندانی منداڵ بۆ ڕێکخستنی کتێبخانەی

ئەلیکترۆنی بۆ خۆی[١]، یان بەکارهێنانی بەرنامەکانی فێرکردن وەك: بەرنامــەکانی وێنــە و گوێبیســتبوون لــە چــیرۆکەکان و دووبــارە تۆمارکردنــەوەیان، یــان بــەکارهێنانی پرۆگرامــە جۆراوجۆرەکــانی کۆمپیوتــەر لــە نموونــەی بەرنامــەی نووســین (Word) و بەرنامــەی خشتەدروســتکردن (Excel) و بەرنامــەی نمایشــکردن (pp) بــۆ شیکردنەوەی ئەرکەکانی، بە تێپــەڕبوونی کــات توانــای منــداڵ بــۆ بــەکارهێنانی ئــەم بەرنامانــە زیــاتر دەبێــت[٢]» هــەروەها دەکرێــت تەکنەلۆژیا بۆ کاتبەسەردنی منداڵ بەکاربهێنرێت بەگوێرەی تەمەن و حەزەکانی، دەکرێت سوود لەو پرۆگرامانە وەربگیرێت، کە مامۆســتا (عبــدالعزیز الحمــادي) لــە ژێــر ناونیشــانی (ڕێبــەری بەرنامــەکانی منــدالآن)دا کۆیکردوونەتــەوە، کــە زیــاتر لــە ٧٠ ئەپلیکەیشــن و ماڵپەری جۆراوجۆر لە هەموو بوارەکاندا بۆ مندالآن لەخۆدەگرێت.



[١] سەیری (الوقت وأهمیته في حیاة المسلم) بکە، (لا ٧).

[٢] سەیری (طفل الروضة في عصر تکنولوجیا المعلومات) بکە (لا ٧).

**٥- بەهێزکردنی ئەو ڕەفتارە ئەرێنییانەی لە خۆچاودێریکردنی منداڵدا دەردەکەون:**

لەوانەیە منداڵ بە بارودۆخێکدا تێپەڕ ببێت، کە خۆچاودێریکردن تێیدا دەربکەوێت، لێرەدا پێویستە پەروەردەکار مەدح و ستاییشی بکات، تەنانەت گەر ئەم هەڵوێستانە بچووکیش بن" بۆ ئەوەی ورەی منداڵ بەرز بێت و ئەو بەهایەی لە لا بچەسپێت. لێرەدا چەند نموونەیەك هەن:

– (هیند) منداڵێکە لە پۆلی شەشەمی بنەڕەتی، دەڵێت: "ڕۆژێکیان دەستەخوشکەکانی قوتابخانەکەم بانگیان کردم بەیەکەوە بچینە دەرەوە بۆ خواردنگەیەکی نزیك، بەڵام من ڕەتم کردەوە - سەرباری ئەوەی هیچ کەسێك لە ئەندامانی خێزانەکەم ئاگای لێ نەبوو، تا لێی بترسم - پاشان کچەکانی تر پاشگەزبوونەوە و یەك لە دوای یەك ڕەتیان کردەوە، تا لە دواییدا تەنیا خاوەن بیرۆکەکە مایەوە، ئەویش لە کۆتاییدا پەشیمان بووەوە!".

– (حەنین) کچێکی ترە لە پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی و دەڵێت: "لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان - یەکەم ڕەزامەنم بوو تێیدا بەڕۆژوو دەبووم - بینیم برا بچووکەکەم بە بەرچاومەوە ئاو دەخواتەوە - منیش زۆر تینووم بوو - نەفسم پێی وتم ئاو بخۆمەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا پەشیمان بوومەوە و ڕۆژووەکەم تەواو کرد".

- (مونتەها) لە پۆلی سێیەمی بنەڕەتییە و دەڵێت: "بینیم ملوانکەیەکی زێڕ لە خاتوونێکی مامۆستام کەوت، لە کاتێکدا ئەو لە قوتابخانە دەردەچوو، منیش چوومە لای و پێمدایەوە".[1]

هەر لەگەڵ بیستنی پەروەردەکار بۆ ئەم هەڵوێستانەی منداڵ، پێویستە ڕاستەخۆ پشتی بگرێت و پێی بڵێت: "کارێکی جوانە، من سەرسامم بە هەڵویستەکەت، کارەکەت بەڵگەیە لەسەر بیرکردنەوەی دروستت". بەکارهێنانی دەستەواژەی هاوشێوە بە ئاوازێ، کە نیشانەی دەربڕینی سەرسامی بێت، زەردەخەنەیەك بەڵگە بێت لەسەر ڕەزامەندی، جووڵەی سەر وەك ڕازیبوون. هەر کاتێك منداڵەکە گوێبیست و بینەری ئەم جۆرە مەدح و سەنایانە بوو، ڕاستەوخۆ هەستی خۆشەویستی و دڵخۆشی و بڕوابەخۆبوون لە دەروونیدا دروست دەبێت، کە پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی کار باشی زیاتر.

### ٦- لەخۆپرسینەوە و ڕاستکردنەوەی هەڵە:

(پێویستە لەسەر موسڵمان - لە هەر پلەوپایە و ئاستێکدا بێت - هەر کاتێك بەتەنیا بوو، دوور بوو لە ژاوەژاوی ژیان، ئاوڕێك لە کردەوەکانی و ڕەفتارەکانی بداتەوە، کە کردوونی" لێپرسینەوە لە خۆی بکات لە هەر کەموکوڕییەك، یان زیادەڕەوییەك کردبێتی. ئەمەیش بۆ ئەوەی بگاتە پلەی کەماڵ و ڕەوشتبەرزی).[2]

---

[1] ئەو یادەوەرییانەی کیژۆڵەکان لە بابەتی پرۆگرامی خۆچاودێریکردن، بۆ جیلی ئامێرە زیرەکەکان دەگێڕینەوە.

[2] سەیری (ملامح التربية الذاتية) بکە، (لا ٦٣).

ئیمامی ماوەردی لەبارەی لەخۆپرسینەوەوە دەفەرموێت: "پێویستە مرۆڤ شەوانە لاپەرەی کردەوەی ڕۆژەکەی هەڵبداتەوە، ئەگەر کاروبارەکانی باش بوون لەسەریان بەردەوام بێت و هاوشێوەیان زیاتر بکات، خۆ ئەگەر خراپیش بوون وازیان لێ بهێنێت و دووبارەیان نەکاتەوە". [١]

پێشەوا (عمر)ی کوڕی (خطاب) ﷺ دەفەرموێت: (لێپرسینەوە لە خۆتان بکەن بەرلەوەی لێپرسینەوەتان لێ بکرێت، کردەوەکانی خۆتان بکێشن بەرەلەوەی بکێشرێن، چونکە گەر ئەمڕۆ لێپرسینەوە لە خۆتان بکەن، ئەوە لێپرسینەوەی بەیانیتان بۆ ئاسان دەبێت. خۆتان جوان بکەن بۆ ڕۆژە گەورەکە، ئەو ڕۆژەی نیشان دەدرێن و هیچ شتێك لە نهێنییەکانتان شاراوە نابێت). [٢]

## • منداڵ چۆن لێپرسینەوە لە خۆی بکات؟

قۆناغی سێ ساڵی لە تەمەنی منداڵ، بە سەرەتای سەربەخۆیی منداڵ و هەستکردن بە بوونی خود دادەنرێت، لە هەمان کاتدا قۆناغی لاساییکردنەوەیشە. هەر لەو قۆناغەدا کرداری جیاکردنەوەی منداڵ بۆ ڕاست و هەڵە، باش و خراپ دەست پێ دەکات، هەموو ئەم کارانەیش بەشێنەیی لەمیانەی قۆناغەکانی ژیانی ڕۆژانەیدا فێریان دەبێت. جا کاتێك منداڵ دایکی دەبینێت ماندووە، گوێبیستی بانگ

[١] سەیری (محاسبة النفس) بکە، (لا ١١).
[٢] حديث موقوف، محاسبة النفس، ابن أبي الدنيا.

دەبێت، وەڵامی دەداتەوە، پاشـان کارەکـەی جێـدەهێڵێت و دەچـێت نوێژ دەکـات" لەوانەیـە منداڵەکـەیش وەك ئـەو وەڵامـی بانگەکـە بداتەوە و لەگەڵی بچێت نوێـژێکی لاسـاییکراوە ئـەنجام بـدات، بـە هەمان شێوە بەها ڕەوەشتییەکانی تریش. بۆیە باشـترین یاسـا، کـە دەکرێت بەهۆیەوە منداڵ فێربکرێت، ئەم یاسایەیە: (**ئەوە بکە، کـە من دەیکەم**)، نەك (**ئـەوە بکـە، کـە مـن پێـت دەڵـێم**)، چـونکە پێشەنگی نموونەیی کاریگەری گەورەی هەیە لەسەری.

هەروەها بایەخدان بە فێرکردن لە ڕێگەی یاری و چیرۆکەوە، بەڵام دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت یادەوەریی منداڵ یارمـەتیی نـادات بـۆ لەبەرکردنی ڕێنمایی و بنەما ڕەوەشتییەکان، توانایشی بۆ گشتاندنی ئەو شتانەی فێری دەبێت لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تـر سـنووردارە، بۆیە دەبێت خۆڕاگر بین لە مامەڵـەکردن لەگـەڵ منـداڵ" تـا ئـەوەی بیرۆکەی ڕاست و هەڵە لە لای دروست دەبێـت، کـە بزانێـت ئـەوەی ئەمڕۆ هەڵەیە بۆ هەموو ڕۆژەکانی تریش هەر هەڵە دەبێت.

لە قۆناغی پێنجەمی تەمەندا، گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵ دەبێت لەبارەی خۆشەویستیی خوای میهرەبان بێت بۆ بەندەکانی، هـەروەها قسەکردن لەبارەی هەندێ لە ناوە پیرۆزەکانی خوا، وەك:

(الخـالق: بەدیهێنـەر): (ئـەو زاتـەی کۆمەڵـە ئەنـدامێکی بـۆ دروسـتکردووین: چـاو، لـووت، دەسـت، ئـاژەڵ و ڕووەکـی بـۆ دروستکردووین، تا سوودیان لێ وەربگرین).[1]

---

[1] سەیری (تنمية المفاهيم الاجتماعية والدينية والأخلاقية في الطفولة المبكرة، حنان العناني)

(الرزاق: رۆزیـدەر): (ئـەو زاتـەی خـواردن و خواردنـەوەمان پـێ دەبەخشێت).[1] لەگـەڵ خۆبـەدوورگرتن لـە شـێوازی وتـاردان، یـان شێوازی ترساندن و تۆقاندن و ڕەخنەی توند.

لە قۆناغی حەوتەمی تەمەندا دەکرێت لـە ڕێـی تـابلۆی وێنـەی ئاسـانکراوەوە بـۆ ئـەو ڕەفتارانـەی پەسـەندن بـۆی تێبگەیـەنرێت، هەروەها بەکارهێنانی چیرۆکی کورت، لەگەڵ ستاییشکردن بۆ کردەوە و وتارە جوانەکانی و یارمەتیدانی بۆ ڕاسـتکردنەوەی ئـەو هەڵانـەی دەیانکات، زیاتر هـان بـدرێت کاتێـك هەڵـەکان ڕاسـت دەکاتـەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی ئەرکەکەی لەسـەر قـورس نـەبێت و هەسـت بـە زەحمەتی کارەکەی نەکات. هەر کاتێك منداڵەکە زیاتر گەشەی کرد، دەبێت زیاتر بۆ خۆلێپرسینەوە هانی بدەین، بەتایبەت لە تەمەنی دە ساڵیدا، لەسەر نوێژکردن و گەشەکردنی ویژدان زیـاتر هـان بـدرێت. دەکرێت خشتەیەك بۆ لێپرسـینەوەی ڕۆژانـە دابنێـت، کـە کۆمەڵـە بەرنامەیەکی هاوسەنگ لەخۆبگرێت و منداڵ ڕۆژانـە بیانکـات، لـە سـەرەتادا بەندایەتییـەکانی وەك نوێـژکردن و قورئانخوێنـدن لـە خۆبگرێت، ئایا ئەنجامی داون؟ ئایا کەموکورییان تێدا بووە؟ سەرجەم ڕەوشتە جوانەکانی وەك ڕاستگۆیی، یارمەتیدان، چاکە لەگەڵ دایك و باوك، پەیوەندیی خزمایـەتی" پاشـان سـەیری ڕەوشـتە ناشـرینەکان بکات، ئایا لەم ڕۆژەدا هیچی کردووە وەك درۆکردن، دزیکردن و...

---

العناني) بکە، (لا ١٥٩).

[1] سەیری (منهج بناء الشصخية الإسلامية، مؤسسة المربي) بکە، (لا ١٠٥).

هتد، لەگـەڵ هانـدانی بـۆ ئـەوەی لـە دوای هـەر خراپەیـەك داوای لێخۆشیبوون و تەوبە بکات و کاری چاکە ئەنجام بدات: ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ﴾ (هود: ١١٤)

واتە: "بەڕاستی کردەوە چاکەکان، کـردەوە خراپـەکان لادەبـەن و گوناهەکان دەشـۆرنەوە". لـە کۆتاییـدا بەرلـەوەی بخـەوێت سـەیری خشتەکەی بکات، سەیر بکات چەندێك قـازانجی کـردووە و چـەندێك زیان، لە پاشاندا بەتەواوی بڕوابەخۆبوونـەوە کەموکوڕییـەکانی ئـەم ڕۆژە تێبپەڕێنێت. ئەم ڕێگەیەیش بە هاوکاریی دایك و باوك دەبێت.

**بەڵام زۆر گرنگە**، کە زیاد لە ئەندازە فشار نەخرێتە سەر منداڵ، بەتایبەت کاتێ تەمەنی بچووکتر بێت شتی بەدەر لـە توانـای خـۆی نەخرێتە سەر شان، لەگەڵ برا و هاوڕێکانی بەراورد نەکرێت، چـونکە ئەو شتەی بۆ منداڵێك دەگونجێت بـۆ یـەکێکی تـر ناگونجێـت" ئـەو منداڵەی دەتوانێت کارێك لە قۆناغی تەمەنێکی دیاریکراودا بکـات یەکێکی تر ناتوانێت. بۆیە ئێمە لێرەدا منداڵ لەسەر خۆلێپرسـینەوە هان دەدەین و ڕایـدەهێنین، لێـرەدا تووڕەبـوون و سەرزەنشـتکردن و هاوارکردن و هەڵشاخان بەسەریدا جێگـەیان نابێتـەوە. کارەکـە زۆر ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بە خۆڕاگری و بەردەوامی و تێکۆشان و پشتبەستن بە خوا هەیە، با لە گەیشتن بـە ئـەنجام و بـەرووبووم پەلـە نەکەین.

## ٧- بیرخستنەوە و ئامۆژگاریکردنی بە گرنگیی خۆچاودێریکردن:

دەوترێت: (باشترین ڕێگە بۆ فێربوون، فێرکردنە)[1]، کاتێك منداڵێك یەکێکی دیکە فێردەکات، ئەوکات ئەم کارە دەبێتە هۆی چەسپاندنی زانیارییەکان لە لای و هەڵکۆڵینی لە دەروونیدا. دوا بە دوای زانینی منداڵ بۆ واتای خۆچاودێریکردن و گرنگییەکەی، هەستکردن بە چاودێریی خوا لەسەری، تێگەیشتن لە ناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار و بەدڵ لەگەڵیدا ژیان، ئینجا دەزانێت چۆن لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی بکات و هەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە و ڕاهێنانی لەسەر بکات. دوای ئەوەی هەڵوێستی جوانی خۆچاودێریکردن لە لای منداڵ دەرکەوت، لێرەدا پێویستە پەروەردەکار منداڵەکەی ئامادە بکات، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریی کەسە نزیکەکانی خۆی بکات و بیریان بخاتەوە، ئەم هەڵوێستە دەبێتە هۆی سەربەرزی و شانازیکردن بە خودەوە لە لای منداڵەکە لەپای ئەو بەهایەی هەیەتی" هەروەها بەهێزکردنی ڕەفتاری جەوهەری وا دەکات زیاتر دەست بە خۆچاودێریکردنەوە بگرێت و بەردەوام بێت لەسەر ئەوەی فێری بووە، دەتوانێت لەو ڕووەوە یارمەتیی هاوڕێ منداڵەکانیشی بدات بۆ بانگهێشتکردنیان و بیرخستنەوەیان، بەم ڕێگەیە:

منداڵێك ڕابسپێردرێت، تا بانگهێشتی هاوڕێکەی بکات و ئامۆژگاریی بکات و بەدواداچوونی لەسەر بکات، ئەم کارەیش لە

---

[1] سەیری (المرشد العملي للتربية على القيم) بکە، (لا ٢٠٠).

ڕێی ناردنی کارتی بانگهێشتنامە، یان ڕەوانەکردنی نامەیەکی ئەلیکترۆنی" یان مۆبایل، یاخود سازدانی چالاکییەك لەسەر ئاستی خێزان، یان قوتابخانە، ئینجا تەکلیف لە منداڵەکە بکرێت سەرپەرشتیی ئەم چالاکییە بکات. دەکرێت لەمیانەی ئەم چالاکییەدا چیرۆك و بەسەرهاتی هەندێ لە پێشینانی پیاوچاك بخوێنرێتەوە، کە ڕووداوی خۆچاودێریکردن تێیدا زەق کراوەتەوە و دەرخستنی سوودەکانی. یان نووسینی بابەتێك لەسەر خۆچاودێریکردن و گرنگییەکەی، هەروەها دانانی پلانێك بۆ زاڵبوون بەسەر کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەم خۆچاودێریکردن، کە لە کۆمەڵگەدا دەوری منداڵیان داوە، یاخود بیرۆکەی تر.

- **ئاستەنگەکانی بەردەم خۆچاودێریکردن و ڕێگەکانی زاڵبوون بەسەریدا:**

**١- نەناسینی حەرامکراوەکان، یان گوێ پێ نەدانیان:**

کاتێك کەسی پەروەردەکار کەمتەرخەمی دەکات لە فێرکردنی منداڵ لە بوارەکانی حەڵاڵ و حەرام و درێغی دەکات لە ڕوونکردنەوەی حەق و ناحەق بەگوێرەی ئەوەی لە کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ هاتووە و گوێیان پێ نادات، لە دەرئەنجامدا منداڵ لە جیهانێکدا ون دەبێت، کە حەڵاڵ و حەرام ناناسێت، وای لێ دەکات منداڵ دەستبەرداری ئامانجە پیرۆز و باڵاکانی ببێت" لەوانەیە هەموو خەمی گەورەی تێربوونی سکی و

تێرکردنی ئارەزووەکانی بێت و بەرەو حەز و ئارەزوو و تاموچێژەکانی دونیا مل بنێت.

**٢- بەکارهێنانی شێوازی دەسەڵاتداری و فشاربۆهێنان و توندوتیژی لە لایەن پەروەردەکار:**

لە گرنگترین کۆسپەکانی بەردەم خۆچاودێریکردن بریتییە لە: بەکارهێنانی شێوازی دەسەڵات لە لایەن پەروەردەکارەوە بەبێ ڕەچاوکردنی ڕێکخستنی دەسەڵاتەکەی، بەکارهێنانی بە شێوازی ستەمکارانە" هەروەها سەپاندنی سیستمی سەرکوتکارانە بەسەر منداڵدا، بە توندوتیژی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، جا توندوتیژیی زمان بێت وەك هەڕەشەلێکردنی بەردەوام و سەرزەنشتکردن و پیاهەڵشاخان، یاخود توندوتیژیی جەستەیی بێت وەك لێدان.. ڕەچاوی تایبەتمەندیی گەشەی منداڵ ناکات، ڕێگەی نادات گوزارشت لە ڕاوبۆچوونەکانی بکات، سەرباری ئەوەی سوورە لەسەر ئەوەی، کە دەبێت تەواو ملکەچی بێت" بەوپێیەی حەزی پەروەردەکار لەسەر ئەوەیە بە زووترین کات دەرئەنجامی گەشەی منداڵەکانی ببینێت. لەڕاستیدا دەرئەنجامەکان تەنیا ڕووکەشین، ئەمەیش ناچاری دەکات ملکەچ بێت، وا لە منداڵ دەکات ڕەفتارەکانی لە ترسی سزادانی بێت، وەك ئەوەی نوێژ بکات، بایەخ بە پاکوخاوێنی بدات، بەسۆز بێت لەگەڵ لە خۆی بچووکتر... لەگەڵ ڕەفتاری تری جۆراوجۆر لە بەرامبەر پەروەردەکاردا، بەڵام هەرکە پەروەردەکار لە بەرچاو نابێت، ئیتر ئەوکات تەواو بەپێچەوانەوە ڕەفتار دەکات.

### ٣- هاوڕێی خراپ:

هاوڕێی خراپ ئەو کەسەیە، کە هاوڕێکەی لە بەندایەتیی خـوا دووردەخاتەوە، ئەمەیش بەدبەختیی دونیا و دواڕۆژیەتی، گوناهـ لـە پێشچاویدا دەڕازێنێتەوە، وەك: نوێژنەکردن، سەرپێچیکردنی دایك و باوك" ئەگەر بیەوێت کارێکی خراپیش ئەنجام بـدات هـانی دەدات و ئەگەر بیەوێت کارێکی باش ئەنجام بدات ساردی دەکاتەوە، خۆ ئەگەر لە بەرامبەر قەدەغەکراوێکـدا شـەرمی کـرد بـۆی ئاسـان دەکـات، تەنانەت لەسەر کەمتەرخەمی لە خوێندندا هانی دەدات" ئەمەیش وا دەکات نەفام دەربچـێت، ڕاوکردنـی لـە لایـەن چـەتەکانی عـەقڵ و ئایینـەوە ئاسـان بێـت - وەك بازرگانـانی مـاددە هۆشـبەرەکان -، هەروەها دەبێتە هۆی بەزایەدانی کات، کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین بە پاراستنی. منداڵ لە هاوڕێ خـراپ جگـە لـە نـاوزڕان و خراپەکاری، هیچی تری دەستناکەوێت. لەوانەیە منداڵ کردارەکـانی خۆی لەگەڵ هاوڕێ خراپەکەیدا بەراورد بکات، ئەوکات گاڵتـەی پـێ دێت، لادان و سەرپێچییەکەی زیاد دەبێت، سەرئەنجامی ئـەم کەسـە گەستنی پەنجەی پەشیمانییە لـە ڕۆژی دواییـدا" وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴾ (الفرقان: ٢٧ - ٢٩)

واتە: "ڕۆژێك دێت ستەمكار پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت و دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایەتەبەر.. مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلان كەسم نەكردایە بە هاوەڵ و دۆستی خۆم.. بەڕاستی گومڕاو و وێلی كردم لە بەرنامەی خوا، دوای ئەوەی، كە پێم ڕاگەیەنرابوو، شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆف دەدات بۆ گوناهـ و تاوان، لە كاتی تەنگانەیشدا پشتی بەردەدات".

**٤- لاوازیی بڕوابەخۆبوون:**

لاوازیی بڕوابەخۆبوون واتە: بڕوانەبوون بەو هێز و تواناییانەی خوای پەروەردگار پێی بەخشیون، بڕوانەبوون بەو ڕەوشت و بەهاییانەی لە خودی خۆیەوە هەڵدەقوڵێن، نەك ئەوانەی لە لایەن دایك و باوكی، یان كۆمەڵگەكەیەوە بۆی دێن" ئەمانەیش هۆكاریان زۆرە، لەوانە:

- ڕەخنەگرتن لە شێوازی كاركردنی منداڵ، یاخود بەردەوام فشارخستنە سەری بۆ ئەوەی كاری زیاتر لەوە بكات، كە لە توانایدایە.

- سزادانی زێدەڕۆیانە لەسەر هەڵە، ئەمەیش وا دەكات منداڵ بە چاوێكی كەم سەیری خۆی بكات.

- بەكارهێنانی شێوازی بەسووك سەیركردن، وا لە منداڵ بكرێت هەست بە ترس بكات، هەڕەشەی بەردەوامی لەسەر بێت بۆ سڵمەینەوە و وازهێنانی لە ئاكار و ڕەفتارەكانی.

- بەراوردکردنی بە هاوڕێ و خزمە هاوتەمەکانی، کە لە هەمان قۆناغی تەمەندان.

ئەم کارانە دەبنە هۆی سڕینەوەی کەسایەتییەکەی، لە پاشان هەستکردن بە کەمی و نەتوانین، دەبێتە نێچیرێکی ئاسان بۆ هاوڕێ خراپەکانی، بەپێی ئاستی زانستی و زانیاری خۆی" ناتوانێت ڕووبەڕووی کەس ببێتەوە، یان ڕێنماییان بکات.

## ئاستەنگەکانی بەردەم خۆچاودێریکردن لەمیانەی بەکارهێنانی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان:

### ١ ئاسان دەستگەیشتن بە قەدەغەکراوەکان بەبێ ڕێگری:

پەنجەداگرتنێکی منداڵێکی بچووك بەبێ ئەوەی لە شوێنی خۆی ببزوێت، لەوانەیە بیگەیەنێتە ماڵپەڕگەلێکی زۆری قەدەغەکراو، نەشیاو و نەگونجاو لەگەڵ تەمەنەکەی، یان ناوەڕۆکی ماڵپەڕەکان ئاداب و ئاکاری دەڕوشێنێت" لەوانەیشە وێنەی نەشیاویان تێدا بێت، کە بەدڕەوشتی و خراپەکاری بڵاودەکەنەوە، لە دەرئەنجامدا ئاکار و ڕەفتارێکی لێ دێتە بەرهەم، کە لە ڕوانگەی ئایین و کۆمەڵایەتییەوە ڕەتکراوەیە. ئەم کارانەیش لەوانەیە لە دووریی چاودێریی دایك و باوك، یان بێئاگایی ئەوانەوە ڕوودات!

### ٢ تەکنەلۆژیا منداڵ تووشی سەرسامیی بینین و بیستن دەکات:

تەکنەلۆژیا بە بەهێزیی سەرنجڕاکێشانی منداڵ بۆ لای خۆی دەناسرێت، ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ دەزگای بینین و بیستن دەکات، بریتییە لە جیهانێکی پڕ لە نەخشەسازیی ڕەنگاوڕەنگ و سەرنجڕاکێش و وروژێنەر، وێنە ئاوێتەی نووسین کراوە" تایبەتمەندی (دەنگ و ڕەنگ) لەگەڵ (چاو و گوێ) کارلێك دەکات، وێڕای بوونی کۆمەڵە شتێکی بۆ کەیف و سەفا، هەروەها بوونی کۆمەڵە توانایەکی سەیروسەمەرە، کە بەبێ ماندوون ڕوودەدەن. هەموو ئەمانەیش لەگەڵ واقیعی ڕاستەقینەی منداڵدا ناگونجێن.

**٣ وابەستەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و خووپێوەگرتنیان:**

(خوپێوەگرتن، یان هۆگربوون) بریتییە لە شێوازێکی نەخۆشی بەرامبەر پێگە و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، وا دەکات منداڵ واز لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆی بهێنێت و ماوەیەکی درێژیان لەگەڵدا بباتە سەر، دەبینین نایشتوانێت دەستبەرداریان ببێت، سەرباری ئەوەی وازیشی لە کارە گرنگ و پێویستییەکانی هێناوە" ئەمەیش هۆکاری دروستبوونی کێشەگەلێکی تەندروستی و دەروونی و کۆمەڵایەتییە، لەوانە: قەڵەوی، ماندووبوونی چاوەکان، خەوزڕان، بیرئاڵۆزی" لاوازیی تەرکیزکردن، دابەزینی ئاستی زانستی، دابڕانی منداڵ لە خێزان بەتایبەت و کۆمەڵگە بەگشتی، تەمبەڵی و خاووخلیسکی" تێکچوونی دەروونی، پەشۆکاوی، خەمۆکی و... هتد.

## • چەند ڕێگەیەك بۆ زاڵبـوون بەسـەر ئاسـتەنگەكانی خۆچاودێریكردن:

### ١- پەروەردەكار حوكمەكانی حەڵاڵ و حەرام ڕوون بكاتەوە:

پێویستە پەروەردەكار حوكمەكانی حەڵاڵ و حەرام وەك چـۆن لــە قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی پێغەمبــەردا ﷺ هــاتووە، بـۆ منـداڵ ڕوون بكاتەوە، پێویستیشە وای تێبگەیـەنێت، كـە سەرچـاوەی ئـەم حوكمانە شەرعی پـیرۆزی خـوای پـەروەردگارن" پەنـدوەرگرتن هـەر بەمانە دەبێت، حوكم تەنیا بۆ خوایە، ئـەو زانایـە بـەوەی چ شـتێك سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت و بەرژەوەندیی ئەوی تێدایە. هاوڕێ لەگەڵ ئەوەی پێویسـتە منـداڵ خـۆی لـەو شـوێنانە بـە دووربگرێـت، كـە سەرپێچی خوای گەورەیان تێـدا دەكـەن: ﴿ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ﴾ (النساء: ١٤٠)

واتە: "هەر كاتێك لە جێیەكدا گوێتان لێبوو كـوفر و گاڵتــە بــە ئایەتەكانی خوا دەكرێت، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا، تا قسە و باسەكەیان نەگۆڕن". هەروەها خۆبەدوورگرتن لەو شوێنانەی فیتنەیان تێدایە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: (... **بڕۆ بۆ فلان شوێن و فلان شوێن، خەڵكانێكی لێیە خـوا دەپەرسـتن، تـۆیش لەگـەڵیان خـوا ببپەرستە، مـەگەڕێرەوە بۆ خاكی خۆت، چونكە بەڕاستی زەوییـەكی خراپە**).[١]

---

[١] سەحیحی موسلیم (١٣/٣٣٨).

یــەکێك لــە دایکــەکان دەڵێــت: "لــە باشــترین ڕێگــەکانی بەهێزکردنی خۆچـاودێریکردن لای منداڵەکـەت، بەسـتنەوەی کـار و کردەوەکانە بە چاودێریی خـوای گـەورەوە، هاوکـات لەگەڵیـدا هـەر کردەوەیەکیش سەرپێچیی شەرع بێت بۆی ڕوون بکرێتەوە“ هـەروەها ڕوونکردنەوەی مەبەسـتە شـەرعییەکان و قـەزا و قـەدەرەکان. ئـەم کارانەیش بۆ ئەوەیە هۆشیار بێت، ئەگەر هەڵەیـەك ناکـات بزانێـت هۆکـاری چـییە، نـەك ئـەوەی وەك زۆرێـك لـە قەدەغـەکراوەکان هۆکارەکەی نادیار بێت و لەبـەر ترسـی چـاودێریی دایـك و بـاوکی نەیکات و نەیشزانێت هۆکارەکەی چییە... جا لەسەر بنەمای ئەمە، منداڵەکە جۆرێك لە زانیاری بەدەست دەهێنێت و گیانی جـوامێریی لا دروست دەبێت کاتێ ئامۆژگـاریی کەسـانی تـر دەکـات، چـونکە ئەوکات ئامۆژگارییـەکانی بە بەڵگە و ڕوونکردنەوە پاڵپشتی کـراون، لە دوای خوای گەورە ئەمەیش هۆکارێکی بـەهێزە، کـە برتییـە لـە (ئامۆژگاریکردن بە زانست)".

## ٢- پــــەروەردەی دەروونیــــی منــــداڵ و جێبــــەجێکردنی پێویستییەکانی:

پەروەردەی دەروونیی منداڵ، بریتییە لە ئامـادەکردنی لـە ڕووی دەروونی و سۆزدارییەوە بۆ ئەرکی سەرشانی ژیانی“ هەروەها بریتییە لە گەشەپێدانی خاسییەتی خێر و باشە و سیفەتە ئەرێنییەکان تێیدا، دەستگرتن بە سیفەتە خۆرسکەکان و گەشـەپێدانیان و دروسـتکردنی ئاراسـتە دەروونییـەکان بەرامبـەر ژیـان و گـەردوون و مـرۆڤ، ئـەم

ئاراستانە جۆرە پێوەرێکی لە لا دروست دەکەن، کە دەتوانێت حەق لە ناحەق، ڕاست لە هەڵە، پەسەند لە ناپەسەند جیا بکاتەوە" هەروەها گەشەپێدانی بەهرە و تواناکان و ڕێکخستنیان لە چوارچێوەی یاساکانی ئیسلامدا بەبێ سەرکوتکردن، یان پێدانی ئازادیی ڕەها.

پەروەردەی دەروونی ڕەچاوی پێویستییەکانی مرۆڤایەتی دەکات؛ ئەو پێویستییانەی بە گرنگترین پاڵنەرەکانی ئاکار و ڕەفتاری ژیانی منداڵ دادەنرێن، ئەم پێویستییانەیش پەروەردەیەکی دروستی کۆمەڵایەتی دەهێننەدی، ئەمەیش لەپێناو دروستکردنی کەسایەتییەکی گونجاو و هاوسەنگ و دوور لە شڵەژان.

دەکرێت لێرەدا ڕوون بکرێتەوە پێویستییەکان ئەمانەن: پێویستیبوون بە دڵنیایی، پێویستیبوون بە خۆشەویستیی دوولایەنە، پێویستیبوون بە ڕێزگرتنی دەوروبەری، پێویستیبوون بە ئازادی" پێویستیبوون بە دانپێدانانی دەوروبەری، پێویستیبوون بە سەرکەوتن، پێویستیبوون بە دەسەڵاتێکی ڕێکخەر، بوارەکانی ژیانی بۆ دیاری بکات.[1]

## ٣- دانانی یاسا و ڕێکخەرێك بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا لە چوارچێوەی خێزاندا:

زۆرجار بابەتی بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن بەبێ بوونی یاسا و

[1] سەیری (الحاجات النفسية للطفل) بکە، (لا ٨).

ڕێکخەرێك بۆ بەکارهێنانی ئـامێرە ئەلیکترۆنییـەکان، وەك ئەوەیـە کەسێك منداڵەکەی فێری مەلەوانی بکات، پاشان لە دەریـادا جێـی بهێڵێـت بـەبێ چـاودێریکردن، خـۆ دەزانـن ئـەوکات چـیی بەسـەر منداڵەکەدا دێت!

لەبەر ئەوەی یاسا و ڕێکخەرەکان سیستم و بەرنامەیەکی ڕۆژانە دەدەنە هەموان، بۆیان دیاری دەکەن، کە پێویستە چی بکـەن و چـی نەکـەن. جـا، ئەگـەر یاسـایەك بـە ڕێککـەوتنی هـەردوو لایـەنی (پەروەردەکار و منـداڵ) دەربچـێت، کاریگـەریی زیـاتر دەبێـت بـۆ پابەندبوون پێی و جێبەجێکردنی. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە، دانانی ڕێکخەرێکە بۆ بەکارهێنانی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان لەناو ماڵ و لە دەرەوە، بێگومان دەبێت پەروەردەکار دڵنیابێت لەوەی توانای هەیـە جێبـەجێی بکـات" هـەروەها کۆنترۆڵکردنەکـەی بەسـەر دۆخەکـە کۆنترۆڵکردنێکی سەرکردانە و بە سیستم بێت، نەك کۆنترۆڵکردنێکی خۆسەپێن و بەزەبر، پێویستە دوور بێت لە توندوتیژی و هاوارکردن.

## * هەنگاوەکانی دانانی یاسا و ڕێکخەرەکان:

- خێزان لە کەشـێکی خۆشەویسـتی و شـادومانیدا کۆببێتـەوە، لەمیانەیدا پەروەردەکار خۆشەویستیی خۆی بۆ منداڵەکە دەربڕێت و ترسی خۆی لەسەری نیشان بدات، لە پاشان لایەنە نەرێنییەکان و ئەو کێشە و گرفتانە باس بکـات لـە چوارچـێوەی بـەکارهێنانی ئـامێرە ئەلیکترۆنییـەکان و خووپێوەگرتنیانـەوە تووشـی منـداڵ دەبـن، لـە

دواتردا داوا بکات چارەسەرێك بۆ ئەم کێشەیە دابنێت" تا لە کۆتاییدا هەردوولا بگەنە یاسایەك بۆ بەکارهێنان، پاشان پەروەردەکار بە منداڵەکە ڕابگەیەنێت، ئەگەر سەرپێچیی لە یاساکە کرد تووشی سزا دەبێت. لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە سزاکە بە قەبارەی هەڵەکە بێت، لەگەڵ سووربوونی پەروەردەکار لە جێبەجێکردنی سزاکە، ئەگەر ڕوویدا (ئەمە ئەگەر منداڵەکە لە ٨ ساڵان گەورەتر بوو، بەڵام گەر بچووکتر بوو، ئەوکات دەبێت پەروەردەکار خۆی یاسا دابنێت و بۆ منداڵەکەی شرۆڤە بکات، کە بۆچی دانراوە).

- دیاریکردنی ئەو ڕەفتارەی داواکراوە لە هەر یاسایەك: بۆ نموونە: (ئامێری ئەلیکترۆنی لە ژووری نووستن قەدەغەیە)، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا بریتییە لە ڕەفتارێکی تر (ئامێرەکەت لە شوێنی دیاریکراو جێبهێڵە و بچۆرە ژووری نووستنەکەت بۆ ئەوەی خەوێکی ئاسوودە و لەسەرخۆ بکەیت).

- هۆکاری نووسینی هەر یاسایەکی بۆ ڕوون بکاتەوە، بۆ ئەوەی منداڵەکە هەست نەکات پەروەردەکارەکەی دەیەوێت تەنیا هێز و توانای خۆی لە چوارچێوەی یاساکە بەسەریدا فەرز بکات.

- ڕەچاوکردنی تەمەن و گەشەی هەر منداڵێك لەناو خێزان زۆر گرنگە، بۆ نموونە: ئەوەی لەسەر منداڵێکی پێنج ساڵان جێبەجێ دەبێت لەسەر منداڵێکی دوانزە ساڵان جێبەجێ نابێت، بۆ وێنە:

(منداڵە تەمەن پێنج ساڵانەکە بۆی هەیە ڕۆژانە کاتژمێرێك سەیری تەلەفزیۆن بکات، بەڵام بۆی نییە ئامێری ئەلیکترۆنی بەکاربهێنێت، بەڵام منداڵە دوانزە ساڵانەکە بۆی هەیە ڕۆژانە بۆ ماوەی کاتژمێرێك ئامێری ئەلیکترۆنی بەکاربهێنێت).

- یاساکان بە شێوەی زۆر ڕوون و جوان بنووسرێنەوە، لە زیاتر لە شوێنێك لەناو ماڵ و لە ژووری هەموان هەڵبواسرێت، لە خوارەوەی یاساکە واژۆی منداڵەکە و پەروەردەکاری لەسەر بێت.

- ناوبەناو کۆبوونەوەی نهێنی لە نێوان هەردوولا ساز دەکرێت بۆ بەبیرهێنانەوە، لەوەیشی ئەنجامی داوە ورەی بەرزبکرێتەوە.

- هەموان داواکراون بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە بەبێ جیاوازی.

- پێویستەی لەسەر پەروەردەکار دەست بە یاساکەوە بگرێت و جێبەجێی بکات و سزای سەرپێچیکارەکەی بدات.

**ئەزموونی خاتوونێکی هاوڕێکم بەناوی (ئامینە مەصلوف):**

منداڵەکان پێویستیان بە کەسایەتیی ڕێکخەر و یاسایی هەیە، بەڵام بەبێ توندوتیژی و لەسەر هەموانیش جێبەجێ بکرێت. ئەم یاسایانە وا دەکەن منداڵەکان زیاتر سەقامگیر و ڕێکخراوبن، مافەکانیان دەستەبەر دەکات" هەروەها مافی دایك و باوکانیش لە ڕێزگرتنیان و نەشێواندنی ئارامییان.. هەموو ئەمانەش - سوپاس بۆ خوا - بەڕاستی بەسەر مندا هاتوون - دوای ئەوەی بە هاوکاریی سەرجەم

ئەندامانی خێزانەکەم یاسا خێزانییەکانم جێبەجێ کـرد -، ئەمـەیش دوای ئەوەی ئامانجی سەرەکیی یاساکەم بۆ ڕوونکردنـەوە" هـەروەها لەگەڵ ئەو بەرهەمـەی لـە داهـاتوودا پێکـەوە بەدەسـتی دەهێـنین. سەرەتای جێبەجێکردنی یاساکەم لە کاتێکدا بوو، کە کچە گەورەکەم تەمەنی شەش سـاڵان بـوو، بـەگوێرەی یاسـاکە قەدەغـە بـوو هـەر منداڵێك ئامێرێکی تایبەت بە خـۆی هـەبێت، بـەڵام ئـازادبوون لـە بەکارهێنانی ئامێری تایبەتیی خۆم (بەگوێرەی تەمەنیان)" بۆ ئەوەی هەموویان لە ژێر چاودێریدا بن. مانگانـەیش بڕێـك پـارەم تـەرخان کردبوو بۆ کڕینی کتێب و یاریی گونجـاو، سـوپاس بـۆ خـوا هـەموو ئەندامان هەستیان بە ڕێزگرتن و بێبەشنەبوون دەکرد. ڕاستە سەرەتا کارەکە قورس بوو، بەڵام جددییەت لە بڕیاردان و نەرمی نەنواندن لە سـزادانی پێشـێلکردنی یاسـاکەدا وای کـرد کارەکـە بـەگوێرەی بەرنامەبۆدارێـژراو بـەڕێوە بچـێت و ئەمـەیش بـووە هـۆی پاشەکشەکردنی زۆرێك لە ململانێی نێوان منداڵەکان، بـەڵام کاتێـك کچە گەورەکەم چووە قۆناغی هەرزەکارییەوە، دۆخەکە کەمێك گۆڕا" وای لێ هات بەرامبەر هەندێ لە یاساکان بێزاری دەربڕێت بەوپێیەی هەستی دەکرد ڕێگری لە ئازادییـەکانی دەکرێـت و خۆیشـی گـەورە بووە، بەڵام بە فەزڵی خوا بەسـەر ئـەم کێشەیەیشـدا زاڵ بـووم. بـۆم ڕوونکردەوە وەك چۆن ئەرك و مافی لەسەرە، ئەرك و مافیشی هەیە، بۆیە دەبێت بە تەواوی جێبەجێیان بکات و ڕێزیـان بگرێـت، پاشـان توانیم هاوڕێکانی ڕابکێشم، کە کاریگەرییان لەسەری هـەبوو. کـە

گەیشتە تەمەنی پانزە ساڵی، ئامێرێکی زیرەکی تایبەتم بۆ کڕی، لـە زۆربەی کارەکان، کە ئەنجامیان دەدات بەشداریم پێ دەکات، بـەڵکو ئامۆژگاریی خوشك و برا بچووکەکانیشی دەکات و لەسـەر ڕێزگـرتن لە یاساکان نەسیحەتیان دەکات.

دەبێت ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بـدرێت، ئـەویش ئەوەیـە، کـە پێویستە یاساکان بە شێوەی زۆردارانە دانەڕێژرێن، دەبێـت یاسـاکان جێگیربن، بـەگوێرەی میـزاج نـەگۆڕدرێن، تـا منداڵـەکان بـڕوا بـە ڕاستگۆیی یاساکان بکـەن" ئەمـەیش وا دەکـات ئەنـدامانی خێـزان زیـاتر لێـك تێگەیشـتنیان هـەبێت، هەسـت بـە بەرپرسـیارێتی و جددییەت و ڕێکخراوی بکرێت.

## * کۆمەڵە یاسـایەکی ئامـادەکراو بـۆ بـەکارهێنانی ئـامێرە ئەلیکترۆنییەکان:

- ڕێگە نەدرێت زانیاریی کەسایەتی بە منداڵ بدرێت، وەك ناو، ناونیشان، ژمارەی تەلەفۆن، چونکە منداڵ نازانێت ئەم ئامێرە چـۆن بەکاربهێنێت.

- ڕێگە نەدرێت منداڵ وەڵامی ژمـارەی نەناسـراو بداتـەوە، لـە حاڵەتی ئاوادا پێویستە پەروەردەکار ئاگادار بکرێتەوە.

- لە کـاتی ڕۆژانـی خوێندنـدا نابێـت منـداڵ بـە بـەکارهێنانی ئامێرەکانەوە سەرقاڵ بێت، بەڵام لە ڕۆژانی پشوودا دەکرێـت ڕۆژانـە

بۆ ماوەی تەنیا کاتژمێرێك، یان دوو کاتژمێر بەکاری بهێنێت.

- زۆر پێویستە ڕۆژانە شتێکی بەسوود فێرببێت و لەبەری بکات، گرنگە خوێندنەوە و گەڕانی بەسوودی هەبێت" هەروەها ئەنجامـدانی کارێك، کە منداڵ حەزی پێیەتی.

- پێویست ناکات منداڵ (نامەی ئەلیکترۆنی)ی تایبەت بە خۆی هەبێت، باشترە پەروەردەکار ئەمە بەکاربهێنێت.

* **پێشنیار بۆ پەروەردەکار:**

- پێویستە دڵنیایی هەبێت لە پاراستنی ئامێرەکە لە ڤـایرۆس و سـیخووڕی بەسـەرییەوە، بـەردەوام پاراسـتنی زانیارییـە کەسایەتییەکانی ناوی نوێ بکرێتەوە.

- چاودێریکردنی مامەڵەی منداڵ لەگەڵ ئینتەرنێت، ئەمەیش بە پێداچوونەوە بەسەر ئەو پێگانەی بەکاری هێناون.

- پێنەدانی (وشەی نهێنی) بەکارهێنانی ئینتەرنێت بـە منـداڵ، ئەمەیش بۆ ئەوەی منداڵ لە کاتی نەگونجاودا سەردانی نەکات.

- ڕاگەیانـدنی (پشـووی ئـەلیکترۆنی)، بـۆ نموونـە: ڕۆژێـك لـە هەفتەدا، لەو ڕۆژەدا سەرجەم ئەندامانی خێزان دەستبەرداری هەموو ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان دەبن.

**٤- دانانی بەرنامەی فلتەر و چاودێری:**

بەرنامەگەلێکی زۆر هەن، کە کار لەسەر چاودێریکردنی منداڵ دەکەن لەمیانەی بەکارهێنانیان بۆ بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان، ڕێگریکردن لەسەردانیکردنیان بۆ پێگە خراپ و قەدەغەکراوەکان، کە لەگەڵ تەمەنی منداڵدا ناگونجێن. ئەمانەی خوارە بەشێکن لەوانە:

- شاردنەوەی ئایکۆنی گەڕان لە منداڵ، بەکارهێنانی ئەو شتەی تایبەتە بەوان، بۆ نموونە:

١- پێگەی www.yahoolignas[١]

٢- ماڵپەری (یا هادي)[٢] کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی تێدایە، کە وا دەکەن ئینتەرنێتەکە پارێزراو بێت بۆ هەموو ئەندامانی خێزان، دەکرێت لە ڕێی ئەم بارکۆدەوە تایبەتمەندیی بەرنامەکە و داگرتنی بزانن:

٣- ماڵپەری www.kidrex.org[٣]

٤- بەرمانەی Gogden Filter Pro

بەرنامەیەکی بەردەستە و بەکارهێنان و داگرتنی ئاسانە، لە

---

[١] سەیری (كيف نربي أبناءنا في زمن الانفتاح الإعلامي) بکە، (لا ١٠١).

[٢] ڕێگا تەکنیکییەکانی پاراستنی منداڵ لە مەترسییەکانی ئینتەرنێت، ئەحمەد کوردی، (بابەتێکە لە ئینتەرنێت بلاوکراوەتەوە)..

(٣) ڕێبەری سەلامەت بەکارهێنانی ئینتەرنێت بۆ منداڵان، ریم فایز، (بابەتێکە لە ئینەرنێت بلاوکراوتەوە).

تایبەتمەندییەکانی: ڕێگری لە بەکارخستن و نمایشکردنی ماڵپەڕ بەدڕەوشتییەکان، دڵنیابوون لە ناوەڕۆکی ئەو ماڵپەڕانەی منداڵەکە سەردانیان دەکات، تۆمارکردنی هەموو سەردانەکانی ئینتەرنێت لەسەر ئامێرەکە، لەگەڵ ئەو ماڵپەڕانەی سەردانی کراون" هەروەها قەدەغەکردنی ماڵپەرە ڤایرۆسییەکان و ڕیکلامە بێزارکەرەکان. بەرنامەکە تۆماتیك خۆی لە بەکارهێنەرانی ون دەکات و کەسی بەکارهێنەر ناتوانێت هەستی پێ بکات.[1]

٥- بەرنامەی K9 Web Protection

بەرنامەیەکی بێبەرامبەرە لە کۆمپانیای Blue Coat دادەبەزێنرێت، بەوە دەناسرێتەوە، کە توانای ڕیزبەندیکردنی ناوەڕۆکی ئینتەرنێتی هەیە بە وردەکارییەکی ئێجگار زۆرەوە، بۆ داگرتنی بەرنامە لە کۆمپانیاکەوە.[2]

لێرەدا شرۆڤەی ڕێگەکانی داگرتن و جێگیرکردنی هەیە:





[1] سەیری (كي نربي أبناءنا الانفتاح الاعلامي) بکە، (لا ١٠٤).

[2] سەرچاوەی پێشوو.

تایبەتمەندیی خێزانی سیستمی (ویندۆز)، مامۆستا (عبدالعزیز الحمادي) شرۆڤەی کردووە:



٦- بەرنامەی (Cyber patro):

بە باشترین بەرنامە دادەنرێت، کە رێگری دەکات لە سەردانیکردنی ماڵپەرە نەویستراوەکان، دەتوانرێت بەگوێرەی تەمەنی منداڵ بەرنامەکە بەدەست بهێنرێت[١]:

٧- بەرنامەی (Surfawatch)

ئەم بەرنامەیە یارمەتیی دایك و باوك دەدات بۆ زانینی ئەو ماڵپەڕانەی منداڵەکەیان سەردانیان کردوون، لە توانایدایە بەرگری بکات لە بەکارهێنانی ١٠ هەزار ماڵپەری خراپ.[٢]

---

[١] سەیری (أولادنا ووسائل التواصل الاجتماعي) بکە، (لا ٨٢).

[٢] هەمان سەرچاوە.

## • پاككردنەوەی (متجـر Play، یـان سـوق Play - ماڵپەری دابەزاندنی بەرنامەكان)[1] لە ناوەڕۆكی بێبایەخ و بێمانا:

لە (ئامێرەكانی ئەندرۆید)دا دەكرێت ئـەم هەنگاوانـەی خـوارەوە جێبەجێ بكرێن:

١- كردنەوە بەرنامەی (متجـر play) لەسـەر شاشـە و پاشـان چوون بۆ (الإعدادات)

٢- چـوونە خـوارەوە و پاشـان دیـاریكردنی بـژاردەی (تصـفية المحتوى)

٣- دانانی نیشـانەی (صـح) لـە بەرامبـەر هـەموویان، پاشـان كلیككردن لەسەر بژاردەی (موافق).[2]

## • دانانی قوفڵ لەسەر هەندێ بەرنامە، بەتایبەت كاتێك ئامێرەكە دەدرێتە دەست منداڵ

---

[1] ئەم هەنگاوانەی لەم كتێبەدا بۆ بەكارهێنانی ئـامێری ئـەلیكترۆنی نووسـراون، بـۆ ئـەو كاتەیە، كە زمانی ئامێرەكە عەرەبی بێت، نێمەیش لەسەر ئـەو بنەمایـە عەرەبییەكـەمان وەك خۆی نووسـیوەتەوە" جا لەبەر ئەوەی زمانی كوردی لەسەر ئامێرەكان نییە، یان كەمـە، بۆیە ناوی بژاردەكانمان وەرنەگێڕاوە بۆ سەر زمانی كوردی. (وەرگێڕ).

[2] سەیری (حلول علية للوالدين عند استخدام التقنية للأطفال) بكە، (لا ٣١).

لە (ئامێرەکانی ئەندرۆید)دا ئەم جۆرە تایبەتمەندییە هەیە، بە جۆرێك جگە لە پەروەردەکار کەسی تر ناتوانێت بەرنامەکان بکاتەوە. لێرەدا هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی قوفڵی بەرنامەکان ڕوون دەکەینەوە:

١- لەسەر شاشەی مۆبایل کلیك بکە لەسەر ئایکۆنی (متجر Play).

٢- پاشان کلیککردن لەسەر نیشانەی گەڕان، پاشان بنووسە (برنامج القفل).

٣- ئایکۆنی بەرنامەی (قفل التطبیق Applouk) دەردەکەوێت، بەرنامەیەکی بێبەرامبەرە، کلیکی لەسەر بکە بۆ داگرتنی.

٤- دواتر کلیك بکە لەسەر بژاردەی (تثبیت) بۆ داگرتنی بەرنامەکە.

٥- دواتر کلیك بکە لەسەر بژاردەی (قبول)، ڕاستەوخۆ بەرنامەکە دەست دەکات بە دابەزین.

٦- لە دوای تەوابوونی دابەزین، کلیك بکە لەسەر بژاردەی (فتح) بۆ کردنەوەی بەرنامەکە.

٧- وشەی نهێنی چوونەژوورەوە داخل بکە، ئەم وشەیە دەبێتە قوفڵ بۆ سەرجەم ئەو بەرنامانەی دەتەوێت قوفڵیان بکەیت.

٨- دواتر بەرنامەکە داوات لێ دەکات دووبارە وشەی نهێنی داخل بکەیتەوە.

٩- داخلکردنی پرسیار و وەڵامی دڵنیایی، تا لە کاتی لەبیرچوونەوەی وشەی نهێنیدا بەکاری بهێنیت.

١٠-لە کۆتاییدا لیستی سەرجەم بەرنامەکانی ئامێرەکەت بۆ دەردەکەوێت، هەموو ئامادەن بۆ ئەوەی قوفڵیان لەسەر دابنێیت، یاخود نا.

١١- نیشانەی نهێنییەکە بخەرە سەر ئەو بەرنامەی دەتەوێت قوفڵی بکەیت.

١٢-دوای دانای قوفڵ بۆ بەرنامەکان دەتوانیت بەرنامەکە دابخەیتەوە.[١]

## • کۆنترۆڵکردنی ئامێرەکە لەپێناو پاراستن و قەدەغەکردنی ئەو بەرنامانەی نەویستراون:

ئەمەیش بۆ ئەو منداڵانەی ئامێری سیستمی (ئەپڵ) بەکار دەهێنن، لێرەدا هەنگاوەکان ڕوون دەکەینەوە.

١- سەرەتا کلیك بکە لەسەر ئایکۆنی (الاعدادات Setting) لەسەر شاشەی ئامێرەکە.

---

[١] سەیری (حلول علية للوالدين عند استتخدام التقنية للأطفال) بکە، (لا ٣٣).

٢- پاشان کلیك لەسەر (الاعدادات العامە) بکە، لە خـوارەوەی شاشەکە وشەی (قیود) دەردەکەوێت، کلیکی لەسەر بکە.

٣- دەبینیت سەرجەم بەرنامەکان بەبێ قوفڵن و دەتوانیت بچیتە ناویان، کلیك لەسەر (تمکین القیود) بکە.

٤- پاشان وشەی نهێنیی چوونە ژوورەوە لە (اعدادات القیود)دا بنووسە، بەو پێیەیش کەس ناتوانێت بچێتە ئەو شوێنە، یـان ژمـارە نهێنییەکە بگۆڕێت، مەگەر بە هەمان ژمارەی نهێنی نـەبێت، وشـە نهێنییەکەیش لە ٤ ژمارە پێکهاتووە.

٥- ئامێرەکە بۆ جاری دووەم داوات لێ دەکات وشە نهێنییەکـە بنووسیتەوە.

٦- ئێستا دەتوانیـت کـۆنترۆڵی سـەرجەم بەرنامـەکان بکـەیت ئەویش بە دانانی کۆت لەسەر بەرنامەکان.

٧- دەتوانیت ئەو بەرنامە قوفڵ بکەیت، کە دەتەوێت، ئـەویش بە جووڵاندنی نیشانەکە لە تەنیشتی. لە کۆتاییدا ئـەم بەرنامەیـەت ون دەبێت، ناتوانیت بچیتەوە ناوی، تا جارێکی دیکـە قوفڵـە، یـان کۆدەکە (قید) لانەبیت.

٨- هەر لەوێ دەتوانیت کۆنترۆڵی جۆری ئەو فیلمانـە بکـەیت، کە ڕێگەیان پێ دەدەیت پیشان بدرێن، یان نا.

٩- دەکرێـت نـاوەڕۆکی ئامێرەکـە لـە بەرنامـە نـەگونجا و

ناشرینەکان پاك بکەیتەوە، ئەم کارەیش بە دیاریکردنی تەمەنی ئەو کەسەی ئامێرەکە بەکاردەهێنێت، بەم جۆرە زۆرێك لە بەرنامە نەگونجاوەکان خۆیان ون دەبن.[١]

- بەکارهێنانی بەرنامەی OurPact بۆ کۆنترۆڵکردنی ئامێری منداڵەکە.
- بەکارهێنانی بەرنامەی Youtube Kids بۆ منداڵان، لەسەر ئامێری ئەندرۆید.

**٥- بەرەنگاربوونەوەی دەستبەتاڵی و دانانی هەندێ جێگرەوە لەبری خووگرتن بە ئامێرە زیرەکەکان:**

دەبێت ماوەکانی دەستبەتاڵی منداڵ کەم بکەینەوە، بیر بکەینەوە لەوەی شتی جێگرەوەیان پێشکەش بکەین، بۆ ئەوەی ئامێرەکانی ئەلیکترۆنی تەنیا بەشێك بن لە ژیانی کەیف و سەفایان، نەك هەموو شت بن" ئەمەیش دەکەوێتە سەر شانی پەروەردەکاران. لێرەدا هەندێ بیرۆکە دەخەینەڕوو، کە لەوانەیە بە پشتیوانیی خوا یارمەتیدەر بێت بۆ پێشکەشکردنی جێگرەوەی سوودبەخش:

- پێویستە لەسەر پەروەردەکار حەز و ئاواتەکانی منداڵەکەی بدۆزێتەوە و گەشەیان پێ بدات، هەر منداڵێك لە بوارێك توانا و

[١] سەیری (حلول علیة للوالدین عند استتخدام التقنیة للأطفال) بکە، (لا ٣٧).

بەهرەی هەیە، ئەم گرنگیپێدانەیش بۆ ئەوەیە، تا لە لای ببێتە حەز و خولیا، دەکرێت بۆ ئەم مەبەستە منداڵ بخرێتە بەر خولی تایبەت، یاخود کڕینی هەندێ کتێبی یارمەتیدەر.

– دابینکردنی کتێبخانەیەکی خنجیلانە بۆ منداڵ، تێیدا هەندێ چیرۆك و کتێبی مەتەڵ و یاریی تێدا بێت، پێشبڕکێی سادە لەمیانەیاندا سازبکرێت.

– تەرخانکردنی کاتێکی خێزانەکە - ئەگەر سادەیش بێت - بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ، یان خوێندنەوەی ژیاننامەی هاوەڵان و پادشا و گەورەپیاوانی مێژوو، لە کۆتاییشدا دەرهێنانی پەند و ئامۆژگاری تێیاندا.

– ئامادەکردنی سووچێکی ماڵ، تا ببێتە شوێنێکی تایبەت بە منداڵ، لەوێدا هەندێ کاتی تێدا بەسەرببات، بەشێك لە پێویستییەکانیشی لەبەردەست بێت، وەك: تێپ، سمغ، کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ، قوتووی پلاستیك" دەفتەر، یان گۆڤاری کۆن و سەللەی زبڵ و... هتد.

– هاندانی منداڵ بۆ وێنەکێشان، پاشان بەرهەمەکانی لە شوێنێك لەناو ماڵ هەڵبواسرێت.

– دابینکردنی یاری پلاسیتکی و حەوزی لم - ئەگەر کرا -، چونکە سوودبەخشە بۆ گەشەی کارامەیی و بەهرەی منداڵ.

– (ژەمێکی تایبەت): ڕۆژێك لە هەفتە تەرخان دەکرێت بۆ

ئامـــادەکردنی ژەمــە خــواردنێکی تایبــەت لــە لایــەن یــەکێك لــە منداڵەکان و بە هاوکاریی هەموان و لـە ژێـر سەرپەرشـتیی دایـك، هەفتەی دواتر منداڵێکی تر دەیکات، ئیتر بەم شێوەیە.

- دەکرێت منداڵ بەشداریی پێ بکرێت لە وەرزشی ڕۆیشتن بـە پێ، یان وەرزشی تۆپی پێ، یاخود وەرزشی تـر. دەکرێـت لەمیانـەی ڕۆیشتندا دار و درەختی دەوروبەر بە منداڵ بناسـێنرێن و پێناسـەی جۆری درەختەکانی بۆ بکرێت.

- تــەرخانکردنی ڕۆژێــك لــە هەفتــە، یــان لــە مــانگ بــۆ سەردانیکردنی شوێنێکی دیار لە شار، یاخود لە لادێ، وەك: بـازاڕ، مۆزەخانە، باخچـە و کتێبخانـە" پلانـی گەشـتکردنەیش لـە لایـەن منداڵەکەوە دابڕێژرێت.

- دابینکردنـــی فەرهـــەنگ و قامووســـی کاغـــەزی، یـــان ئەلیکترۆنی، منداڵ ڕابهێنرێت، تا لە کاتی توشبوون بە زانیارییەکی قورس، یان وشەیەکی زەحمەت تێیدا بگـەڕێت" پێویستیشـە لەسـەر کەسی پەروەردەکار سەرەتا لـە کـاتی گەڕانیـدا یارمـەتیی بـدات و پاشان هانی بدات بۆ ئەوەی لە دواتردا بۆ خۆی بگەڕێت.[1]

- هەفتانە کاتژمێرك تەرخان بکرێت بۆ هەندێ چالاکی لەگەڵ منداڵ ئەمەیش بۆ گەشەکردنی هەندێ بـەها لـە لای، جـا دەکرێـت چالاکییەکانی ئەم کتێبەبن، یان کتێبی (القيم التربويـة الأسـرية) لـە

---

[1] سەیری (كيف نجنب أبناءنا مخاطر الإعلام) بکە (لا ٦٧).

ئامادەکردنی (د. علي الشبيلي)، یاخود کتێبی (المتعه التربويه) لە ئامادەکردنی (قمم المعرفه)، یان کتێبی (ڕێبەری پەروەردەکار، بۆ چالاکی پەروەردەیی)، لەسەر ئەم لینکەی خوارەوە:



### ٦- پێشەوایەتی:

(دکتۆر عبدالکریم بکار) دەڵێت: "لەو کاتەی منداڵەکانمان پەروەردە دەکەین، ناتوانین ڕۆڵی پەروەردەییمان بە کارامەیی بگێڕین، گەر کار نەکەین لەسەر پەروەردەکردنی خۆمان، چونکە هەر یەکێك لە ئێمە چەند عەیب و کەموکوڕییەکی هەیە پێویستیان بە چاککردن هەیە. لێرەدا دەڵێم: پێویستە منداڵەکان لە ماڵەکاندا دایك و باوکیان بە پێشەوا و پێشەنگی خۆیان ببینن". دەکرێت ئەم کارانەی خوارەوە بکرێن:

- دوورخستنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان لە دانیشتنە خێزانییەکان.

- ئامێرەکان سەرقاڵت نەکەن لە خوێندنەوەی کتێب

- ئامێرەکان بۆ یاری و گاڵتە بەکارنەهێنرێن.(١)

## ٧- لە کۆتاییدا:

## منداڵەکانتان پێشنیارتان بۆ دەکەن تا بەکارهێنانی ئامێرە زیرەکەکان بە یاسا بکرێن

لە بەرنامەی (خۆچاودێریکردنی جیلی سەردەمی ئامێرە زیرەکەکان)دا، کە کچانی تەمەن ٩ تا ١٢ ساڵی دەگرێتەوە، ئەم پرسیارەیان ئاراستە کرا: چارەسەری ئەو منداڵانە چییە، کە وا نیشان دەدەن دەرس دەخوێنن، بەڵام لەڕاستیدا یاری بە ئایپاد دەکەن؟

وەڵامی زۆربەیان باس لە بەیاساکردنی بەکارهێنانی ئامێرەکان دەکات، کە دەڵێن: "دیاریکردنی کات بۆ یاریکردن بە ئایپاد"، "دیاریکردنی کات بۆ لێسەندنەوەی ئایپاد"، "دانانی خشتەیەك بۆ ئەو کارانەی لەسەر منداڵ پێویستە ئەنجامیان بدات"، "دیاریکردنی سزا لە حاڵی یاریکردن لە کاتی پێداچوونەوەی وانەکان"" "هاندانی منداڵ بۆ ئەوەی جەخت لەسەر وانەکانی بکاتەوە"، لەگەڵ کۆمەڵێك وەڵامی تر، کە هەموویان لە دەوری ئەم واتایە دەسوورێنەوە!

منداڵەکان هەست دەکەن، کە کێشەیەك هەیە و پێیەوە دەناڵێنن، کاریگەریی کردووەتە سەر هەموو ژیانیان، بەڵام خودی

---

(١) سەیری (أولدانا ووسائل التواصل الاجتماعي) بکە، (لا ٧٦).

خۆیان ناتوانن چارەسەری بکەن تەنیا بە یارمەتیدانی پەروەردەکار نەبێت، ئەمەیش قسەی (هیند)ـە، کە پۆلی شەشەمی بنەڕەتییە و دەڵێت: "ناتوانین وازی لێ بهێنین، مادام لەبەردەستماندایە!"

## نامەی منداڵێك بۆ دایك و باوكی:

دایە، بابە! هەست بە خۆشەویستیتان دەکەم بەرامبەرم، هەست بە دابینکردنی هەموو پێداویستییەکانم دەکەم، ئەمەیش بۆ ئەوەیە من هەست بە کەمی نەکەم بەرامبەر ئەوانیتر، بەڵام ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت کاری باشترە بۆ من" هەندێ کاتم بدەنێ، بۆ ئەوەی تاموچێژ لە منداڵیم وەربگرم، من بە هەبوونی چالاکی و وزە دەناسرێم، حەزم لێیە جووڵە بکەم" لێرە و لەوێ غار بدەم، بازبدەم و هاوار بکەم... پێویستم بەوەیە دەوروبەری خۆم بدۆزمەوە، لێمگەڕێن وەك دڵی سافی منداڵ یاری بکەم و بژیم، بۆیە حەز بە یاری و جووڵەی زیاتر دەکەم دوور لە ئامێرە زیرەکەکان، کە ئازادیی منیان کۆت و بەند کردووە. با بیشزانن من حەزی گەڕان و پرسیاری زۆرم هەیە، پێویستم بە ڕوونکردنەوەی هەموو ئەو شتانەیە، کە دەکەونە بەرچاوم. ئەگەر ڕێگەتان پێدام ئامێرە زیرەکەکان بەکاربهێنم، هەندێ ڕێکارم بۆ دابنێن، تا لە جیهانی ئینتەرنێت بمپارێزێت، چونکە من هێشتا بچووکم" ئەم شتە بە سادە وەرمەگرن. بە خۆشەویستی و بڕیاردانی ڕێکوپێکەوە مامەڵەم لەگەڵ بکەن، کاتێکی کەمم بدەنێ، تا فێری تەکنیکەکانی ئەلیکترۆنی ببم و سوودیان لێ وەربگرم، نەکا ببنە هۆکاری زیانپێگەیاندن و بەفەتارەتدانم!

لە بۆنە خۆشەکانی وەك جەژن و شادییەکاندا ئامێرەکانم لێ دووربخەنەوە، بۆ ئەوەی بتوانم لەگەڵ هاوتەمەنەکانمدا یاری و گاڵتە بکەم و پەیوەندییان لەگەڵ ببەستم، توانستە کۆمەڵایەتی و سۆزدارییەکانم گەشە پێ بدەم، تا کاتێك گەورە بووم بۆم ببێتە یادگارییەکی خۆش!

ئارامم لەسەر بگرن کاتێك بێزار دەبم، یان زۆرتان لێ دەکەم لەسەر ڕەتکردنەوەی کۆت و پێوەند و یاساکان، بیرم بخەنەوە، کە ئەمانە بۆ پاراستنی منن و لەپێناو خۆشەویستی و بایەخپێدانتاندا بۆتان داناوم. دەنگم پێ کپ مەکەن، ڕاستە لەوانەیە سەرەتا بێزارتان بکەم، تا لە خووگرتن بەم ئامێرانە چاك دەبمەوە، بیربکەنەوە، کە ئەمە تەنیا مەسەلەی کاتە، تا لەگەڵی ڕادێم. بە دوای جێگرەوەیەکدا بگەڕێن بۆم (بێگومان ئێوە بۆم دابین دەکەن، تا نەوەکو دەستبەتاڵی و بێکاری بمکوژێت!)

هەردووکتان بۆم ببنە پێشەنگ و نموونەی باڵا لە بەکارهێنانی ئامێرەکان، فەرمانم پێ مەکەن بە خوێندنەوەی کتێب لە کاتێکدا بێفایدە خۆتان بە ئامێرەکانەوە سەرقاڵ کردووە!

لە هەندێ کار و چالاکیدا بەشداریم پێ بکەن - ئەمە زۆر دڵخۆشم دەکات - لە نزیکتان دەکاتەوە لێم، وا دەکات هەست بە دڵئارامی و گرنگپێدان بکەم. لە خوا زۆر بپاڕێنەوە بۆم، تا ببمە ئەندامێکی چالاك لە کۆمەڵگە و ڕەزامەندیی خوا بەدەست بهێنم و

ڕێگەی دروست بگەرمەبەر، تا خوای گـەورە بـە سـاڵحبوونی مـن، ئـۆقرەیی و ڕوونـاکی بـە چـاوەکانتان ببەخشـێت و ببمـە بەشـێك تـەرازووی چـاکەکاتنان لـە ڕۆژی دواییـدا: ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ (الفرقان: ٧٤)

واتە: "پەروەردگارا! لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسـانێکمان پـێ ببەخشە، کە ببنە مایـەی ڕوونـاکیی دیـدە و شـادومانیی دڵمـان و بمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان".

**واژۆ: کچە بچکۆلانەکەتان.**



## • دووەم: تایبەتمەندییەکانی قۆناغی منداڵی:

هەر قۆناغێکی تەمەن بە چەند تایبەتمەندییەك لـە قۆناغـەکانی تر جیا دەکرێتەوە، زۆرجار ئەوەی پەروەردەکار لە منداڵەکەیـدا وەك کێشەیەك دەیبینێـت، لەڕاسـتیدا تـەنیا بریتییـە لـە تایبەتمەنـدیی گەشەی منداڵەکە، بۆیـە وا باشـترە کەسـی پـەروەردەکار شـارەزای قۆناغەکانی تەمەن بێت، تا بزانێت منداڵەکەی بە چی لەوانیتر جیـا دەکرێتەوە" هەروەها تا بە شێوەیەکی جوان مامەڵە لەگەڵ ئەو شـتە بکات، کە پێیوایە کێشـەیە. جـا هەرچـەند پـەروەردەکار زانیـاریی

زیاتری بە تایبەتمەندیی گەشەی منـداڵ و پێویسـتییەکانی هـەبێت، هێنـدە سـەرکەوتن و پـەروەردەکردنی دروسـتی منداڵەکـەی زیـاتر دەبێت. لێـرەدا هەنـدێ تایبەتمەنـدی بـاس کـراون، هەرکەسـێکیش ویسـتی زیـاتر بزانێـت پێویسـتە بگەڕێتـەوە سـەر کتێبـەکانی دەروونزانیی گەشە، وەك کتێبی (دەروونزانیی گەشە لە کۆرپەوە، تـا پیری)ی لە نووسینی (عادل الأشـول)، یـاخود کتـێبی (دەروونزانیـی گەشە: منداڵی - هەرزەکاری - پیری) لە نووسینی (عباس عـوض)، یـاخود کتـێبی (دەروونزانیـی گەشـەی منـداڵی و هـەرزەکاری) لـە نووسینی (حامد زهران)، لە کۆتاییشدا کتـێبی (گەشـەی ڕەوشـتی، منداڵی و هەرزەکاری) لە نووسینی (محمود عطا حسین).

## ≡ قۆناغی دەستپێکی منداڵێتی لە (٣ تا ٦) ساڵی:

– لەو قۆناغەدا توانای جووڵە و بازدانی زیـاتر دەبێـت، توانـای دروستکردنی وێنەی بازنە و چوارگەشەی دەبێت، تا دەگاتـە توانـای لەبەرکردنی جلوبەرگ و بەدەستگرتنی قەڵەم و نووسین، سەرکەوتن و دابەزین و... هتد.

– پرسیارکردنی زۆر لەو قۆناغەدا، منداڵ وای لـێ دێـت حـەزی زۆری بۆ پرسیارکردن لا دروست دەبێت، سەبارەت بە هـەموو شـتێك پرسیار لە دەوروبەر و کەسـانی گـەورە دەکـات (بۆچـی؟ لـە کـوێ؟ چۆن؟)

- زۆر لاساییکردنەوە: منداڵ لاسایی هەموو شتێك دەکاتەوە، گەر باوکی جگەرە بکێشێت هەوڵی لاساییکردنەوەی دەدات، گەر دایکی وشەی ناشیرینی لە دەم بێتە دەرەوە لاسایی دەکاتەوە، گەر بینیی باوکی نوێژ دەکات بۆ نوێژکردن دەچێتە تەنیشتی... کەواتە منداڵ لەم قۆناغەدا لاسایی دەکاتەوە، جیاوازی لە نێوان ڕاست و هەڵەدا ناکات.

- چەمکەکانی ژماردن، کات، شوێن، قەبارە و شێوە لە لای دروست دەبن، توانای لەبەرکردنی بۆ پەیدا دەبێت، تا لە کۆتایی ئەم قۆناغەدا دەگاتە ئاستێك پێی دەوترێت (سەردەمی زێڕینی بیرەوەری).

- خەیاڵ لە لای بەهێز دەبێت بە جۆرێك بەسەر واقیعدا زاڵ دەبێت، منداڵ خەیاڵەکانی لەمیانەی یاریکردندا زیاد دەکات" هەروەها خەونەکانی بەسەر واقیعدا گەورە دەبێت، وای لێ دێت بیرکردنەوەکانی پشت بە وێنەی هەستی دەبەستێت، لەم قۆناغەدا فێرکردن لە ڕێگەی یارییەوە باشتر و بەسوودترە لە فێربوون بە ڕێگەی وانەوتنەوە و شرۆڤەکردن.

- سەرنجدانی منداڵ لەم قۆناغەدا زیاتر بۆ شتە هەستپێکراوەکانە، بۆ نموونە: سەرنجی منداڵ زیاتر بۆ پرۆگرامەکانی کارتۆنە، چونکە سەنجڕاکێش و بە باقوبریقن، حەزی گەڕانی لە لا

دروست دەبێت و تێگەیشتنی فراوان دەبێت، ئەزموون لە جیهانی دەوروبەری وەردەگرێت.

- هەڵچوونەکانی منداڵ بە توندی و زیادەڕۆیی دەناسرێت، لەوانە (دڵخۆشیی زۆر، تووڕەیی زۆر و...هتد) ئەم هەڵچوونانەیش زوو گۆڕانیان بەسەردا دێت، دەبینین زوو هەڵدەچێت و زوویش دادەمرکێتەوە.

- بازنەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی فراوان دەبێت، جۆری پەیوەندییەکانیش لە نێوان ئەمانەدا دەبێت: هاوڕێیەتی، ڕێزگرتن، کێبڕکێ، مەیلی بەرهەڵستی، خۆویستی و حەزی موڵکداری.

- وا بە باش دەزانێت یاری لەگەڵ کەسانی دیکەدا بکات، لەوانەیشە بەتەنیا بیکات، هەندێ هاوڕێی خەیاڵی دروست دەکات، کە چیی بوێت لە دونیا خەیاڵاوییەکەیدا بۆی دەکەن" هەر ڕەگەزێك حەزی لەو چالاکی و یارییەیە، کە لەگەڵ سروشتی ڕەگەزەکەی دەگونجێت.

- منداڵ لەم قۆناغە پێویستی بە سەرنجپێدانە، بۆیە پێویستە ڕەچای ئەم خاڵە بکرێت، منداڵ دڵنیابکرێتەوە، هەندێ جاریش وا پێویست دەکات بەرامبەر هەندێ ڕەفتاری منداڵەکە خۆمان بدەین لە گێلی" هەورەها منداڵ پێویستی بە سەربەخۆیی هەیە بە شێوەیەکی بەرچاو، بۆیە لێرەدا پێویستە لە کاتی ئەنجامدانی هەندێ کاروباریدا یارمەتی بدرێت و هان بدرێت.[١]

---

[١] سەیری (علم نفس النمو، حامد زهران) بکە، (لا ٢٠٣)، هەروەها سەیری (النمو

## • قۆناغی ناوەندیی منداڵێتی (لە ٦ تا ٩)ساڵی:

– توانای تێگەیشتن و لەبەرکردن و سەرنجدانی زیاتر دەبێت، بیرکردنەوە گەشە دەکات، نیشانەکانی تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی لە لا دەردەکەوێت، بۆ نموونە: ئەگەر بینیی کەسێك دەگری، هەوڵ دەدات ئەو بارودوخە بزانێت، کە وای لێ کردووە بگری.

– خەیاڵی منداڵ بەرەو واقیعبوون و داهێنان دەچێت، دەتوانێت جیاوازیی نێوان خەیاڵ و واقیع بکات، حەزی گەڕان و زانین لە لای زیاتر دەبێت.

– پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی منداڵ لەگەڵ چوونی بۆ قوتابخانە زیاتر دەبێت، گرنگیدان بە تواناکانی و هۆشیاربوون بە خودی خۆی زیاد دەبێت، دەتوانێت ڕەفتارەکانی ڕاست و دروست بکات.

– هەڵچوونەکانی منداڵ زیاتر جێگیری بەخۆیانەوە دەبینن، لێرەدا منداڵ دەزانێت چۆن هەڵچوونەکانی بە ڕێگەی بنیادنەر تێر بکات، نەك بە ڕێگەی توورەبوون وەك ئەوەی پێشووتر هەیبوو.

– جۆری ترسەکانی منداڵ گۆڕانی بەسەردا دێت، دوای ئەوەی

---

الإنساني الطفولة والمراهقة،محود عطا) بکە، (لا ١٧٣). سەیری (خصائص النمون لدى الأطفال، مروة عاشور) بکە، (لا ٢٤).

پێشتر لە تاریکی و دەنگە بەرزەکان دەترسا، لە ئێستادا لە قوتابخانە و مامۆستا و دز و شتی تر دەترسێت.

– منداڵ لەم قۆناغەدا پێویستی بە خۆشەویستیی بێ مەرج هەیە، پێویستی بە هاورێیەتی، دڵنەرمی، هەستکردن بە ئارامی، ڕێزلێگرتنی کۆمەڵایەتی، قەبووڵکرانی لە لایەن خەڵکییەوە هەیە، جا ئیتر کەسوکاری خۆی بن، یان هاورێکانی.[١]

[١] سەیری (علم نفس النمو، حامد زهران) بکە، (لا ٢٤٧)، هەروەها سەیری (النمو الإنساني الطفولة والمراهقة،محود عطا) بکە، (لا ٢٠٠) و (خصائص النمون لدى الأطفال، مروة عاشور) بکە، (لا ٣٤).

## • قۆناغى كۆتايى منداڵێتى، لە (٩ تا ١٢) ساڵى:

- گەشەى بيرەوەرى لەوەى پێشووتر زياتر دەبێت، منداڵ تواناى داهێنانى لە لا دروست دەبێت، خۆشەويستيى گەڕان و خوێنگەرمى و پەرۆشيى لە لا زياد دەبێت.

- منداڵ هەوڵ دەدات هەڵچوونەكانى كۆنترۆڵ بكات و دان بەخۆيدا بگرێت، دەستبەردارى منداڵێتى ببێت، وەك ئەوەى هەست بكات ئيتر گەورە بووە.

- منداڵ فێر دەبێت چۆن دەستبەردارى پێويستييە پەلەكانى بێت، ئەوانەى لەوانەيە دايك و باوكى تووڕە بكات، بۆيە شۆڕشەكانى دەرەوەى كەم دەبێتەوە.

- هەستياريى بەرامبەر گاڵتەپێكردن و ڕەخنەلێگرتن لە لايەن دايك و باوكى، يان نزيكەكانى زياد دەبێت، بە لەدەستدانى باوانى، يان يەكێكيان شپرزەيى و شڵەژانى لە لا دەردەكەوێت.

- كاريگەريى هاوڕێكانيى لەسەر زياد دەبێت، دەبينين بە هەمان پێوەرى ئەوان پێوانە دەكات، هاوكارييان دەكات، بە حەز و خولياكانيان كاريگەر دەبێت.

- هەستكردن بە بەرپرسيارێتى و سەربەخۆبوون و حەزى

دروستبوونی تایبەتمەندیی لە لا زیاد دەکات، پشتبەستنی بە کەسانی گەورەیش کەم دەبێتەوە.

- منداڵ لەم قۆناغەدا پێویستی بە دەستکەوت هەیە لە یەکێك لە بوارەکاندا، هەموو تواناکانی خۆی بۆ سەرکەوتن تێیدا سەرف دەکات، لەسەر کەسوکاریش پێویستە لەم ڕووەوە هاوکاریی بکەن.[1]

[1] سەیری (علم نفس النمو، حامد زهران) بکە، (لا ٢٤٧)، هەروەها سەیری (النمو الإنساني الطفولة والمراهقة،محود عطا) بکە، (لا ٢٠٠)، سەیری (خصائص النمون لدى الأطفال، مروة عاشور) بکە، (لا ٣٩).

# بەشی دووەم
# چەند چالاکییەك بۆ بەهێزکردنی بەهای خۆچاودێریکردن

لەگەڵ گۆڕانی سەردەم و گۆڕینی تایبەتمەندییەکان، پێویستە پەروەردەکاران شێوازە تەقلیدییەکانیان بگۆڕن، ئەو شێوازانەی پێشووتر پشتیان پێ دەبەستن و بەتەنیا جەختیان لەسەر پەروەردەکار دەکردەوە، پێویستە لەگەڵ شێوازە سەردەمەییەکاندا بیانگۆڕنەوە. ئەم شێوازە تازانە هانی منداڵ دەدەن پەیوەندیی نێوان خۆی و پەروەردەکارەکەی گەشە پێ بدات، لە دەرئەنجامدا دەبێتە هۆکارێك بۆ بەرەوپێشچوونی حەز و خولیای بۆ بیرکردنەوە و گەڕان، دواتر بڕوابەخۆبوون و حەزی سەرکەوتنی لە لا بەهێز دەبێت. جا هەرشتێك خۆی بەدەستی بهێنێت کاریگەریی زیاتری دەبێت لەسەری، بە بەراورد بەو شتەی کەسێکی تر بەدەستی دەهێنێت بۆی.

بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن پێویستی بە چالاکیی ئەنجامدان و ڕاهێنان هەیە، جا پێویستە ماوەی چالاکییەکانی ئەم خۆچاودێریکردنە تارادەیەك درێژ بێت، ئەمەیش بۆ ئەوەی منداڵەکە بە تەواوی بگاتە ئاستی خۆچاودێریکردن، بۆ نموونە: دیاریکردنی

ڕۆژێك لە هەفتە بۆ بەهێزكردنی خۆچاودێریكردن، گەر بۆ ماوەی دوو مانگ ئەم كارە دووبارە بكرێتەوە باشترە لەوەی بۆ ماوەی مانگێك بێت، بەم شێوەیە ماوەی جێبەجێكردنی یەك چالاكی بەستراوەتەوە بەگوێرەی قۆناغی تەمەنەوە، بۆ وێنە: ماوەی چاوپێكەوتنی تایبەت لەگەڵ منداڵێك، كە لە قۆناغی ناوەندیدایە جیاوازە لەگەڵ منداڵێك لە دوا قۆناغی منداڵیدایە، ئەوەی یەكەمیان پێویستی بە نزیكەی ٦٠ خولەك هەیە بۆیەك چالاكی، جا لەوانەیە ماوەكە بەگوێرەی چالاكییەكە زیاد و كەم بكات.

لێرەدا چەند چالاكییەك دەخەینەروو، كە بە پشتیوانیی خوا یارمەتیدەر دەبن لە بەهێزكردنی خۆچاودێریكردنی منداڵ. چالاكییەكان بەسەر دوو بەشدا دابەش كراون، بەشی یەكەم چالاكییەكانی تایبەت بە قۆناغی ناوەندی منداڵێتی، بەشی دووەم چالاكییەكانی تایبەت بە دوا (كۆتایی) قۆناغی منداڵێتی.

## یەکەم: چالاکی تایبەت بە قۆناغی منداڵیتیی ناوەندی:

### (١)

لــەم چــالاکییەدا کەســی پــەروەردەکار فەرمایشــتی خــوا دەخوێنێتەوە: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (الحديد: ٤)

واتە: "لە هــەر شــوێنێك بــن ئــەو زاتــە لەگەڵتاندایــە و پێتــان دەزانێت، دڵنیابن، کە خوا بینایە بە هەموو ئــەو کــار و کردەوانــەی ئەنجامیان دەدەن". پاشان ئایەتەکە بــۆ منــداڵ شــرۆڤە بکــات، کــە نابێت بڵێین: خوای گەورە لە هەموو شوێنێکە، چونکە ئــەم قســەیە واتای وایە لەناو هەموو شتێك بوونی هەیە، ئەمەیش ڕاســت نییــە، بەڵکو ئێمە پابەندین بەوەی لە سوننەتدا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ لــە کیژۆڵەیەکی کۆیلەی پرسی: **خوا لە کوێیە؟** وتی: لە ئاسمانە. ئینجا پێی فەرموو: **من کێم؟** وتی: تۆ پێغەمبەری خوایت. پێغەمبــەر ﷺ فەرمووی: **ئازادی بکەن، ئەمە بڕواداره**).[١] لەگەڵ ئەوەی لە ئاسمانە، بەڵام دەتوانێت بمانبینێت و گوێبیستمان بێت لە هەر شوێنێك بین.[٢] پاشان بەفراوانی باسی ناوی پیرۆزی (البصیر)ی بۆ بکات، وەك ئەوەی لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا هاتووە.

***

---

[١] موسلیم گێڕاویەتییەوە (٥٣٧).

[٢] سەیری (پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان) بکە، (لا ١٦).

* پەروەردەکار داوا لە منداڵ دەکات بە هاوکاریی دوو منـداڵی تر، ئەم هێڵە تێکەڵاوانە ببڕێت، تا دەگات بە کـاری چـاکە و باشـە، ئینجا ئەم کارە ببەستێتەوە بەوەی، کە خوای پەروەردگار (البصیر — بینەر)ـە و هیچ کردەوەیەکی باشی مرۆڤەکانی لە لا بەزایە ناچێت.



**(٢)**

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار ڤیدیۆی چیرۆکی (خوا دەمانبینێت) بۆ منداڵەکەی نمایش دەکات.



پاشان ئەم پرسیارانەی لێ بکات؟

- ئەحمەد چیی کرد، کاتێك پیاوە حەکیمەکە سێوەکەی پێدا؟

.............................................................

.............................................................

- ئەوە کام ناوە پیرۆزەی خوایە، کە لەم چیرۆکەدا فێری دەبین؟

.............................................................

.............................................................

- چ سوودێکمان لەم چیرۆکە بینی؟

.............................................................

.............................................................

***

(٣)

لێرەدا پەروەردەکار ڤیدیۆیەکی تر پیشانی منداڵەکە دەدات



ئینجا پەروەردەکار پرسیار لە منداڵەکە دەکات:

- کام ناوە پیرۆزەی خوای گەورە لەم چیرۆکەدا هەیە؟

............................................................

............................................................

- دواتر پەروەردەکار هانی منداڵەکە دەدات بۆ ئەوەی وێنەی درەختێك بکێشێت لە کۆمپیوتەر، یان لەسەر کاغەز، دواتر ڕەنگی بکات و بەروبوومی لەسەر دروست بکات (ئەمەیش لە سوودەکانی چیرۆکی ناو ڤیدیۆکەیە).



(٤)

ئەمجارە ڤیدیۆکە (دەستپاکی) نیشان دەدات:



پاشان پەروەردەکار ئەم پرسیارانە لە منداڵەکە دەکات:

- پێغەمبەر ﷺ بە چی بەناوبانگە؟

.....................................................................

- بڕیاری (سەلما خان) چی بوو، کاتێك گوێبیستی ڕەوشتی دەستپاکی بوو؟

.....................................................................

- نموونەیەك لە ژیانتدا باس بکە، کە ئەمانەتت تێدا پاراستووە؟

.....................................................................

- منداڵ هان دەدرێت، کە ڕەوشتی دەستپاکی ببەستێتەوە بە ناوێکی پیرۆزی خوای گەورەوە، وەك: (العليم – زانا)، (کە زانستی ئەو زاتە دەوری هەموو شتێکی داوە، هیچ شتێك لە کردەوەکانمانی لێ ون نابێت).

## (٥)

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار وێنەی هەندێ ڕەفتاری جوان نیشانی منداڵ دەدات، پاشان داوای لێ دەکات ناو لەم ڕەفتارانە بنێت (یارمەتیدان لە کاروباری ناوماڵ، پاکوخاوێنی، بەزەیی هاتنەوە بە منداڵدا، خوێندنەوەی کتێبی بەسوود)، ئینجا بەستنەوەی بە ناوی پیرۆزی (الرقیب - چاودێر)ی خوای گەورەوە، دوای ئەوەی بۆی شی دەکرێتەوە، کە (ئەو زاتە چاودێرە بەسەر هەموو کار و کردەوە و بارودۆخەکانمانەوە).



*منداڵ هان دەدرێت بۆ ئەوەی ناوی ڕەفتارە جوانەکە لەسەر (شەمەندەفەرە جوانەکە) بنووسێت، پاشان ڕەنگی بکات و لە شوێنێکی دیاری ناوماڵدا هەڵبواسرێت.



(٦)

لەم چالاكییەدا پەروەردەكار لەگەڵ منداڵەكەی سورەتی (الملك) دەخوێنێتەوە، واتای ئەو ئایەتانەی بۆ تەفسیر دەكات، كە قورسن. لەم ڕووەوە دەكرێت پشت بە هەندێ كتێبی تەفسیر ببەستێت، یان بەرنامەی قورئان و تەفسیری وەك (آیات). دواتر ئەم یارییەی لەگەڵ دەكات، یاریی (من چاودێرم)، هانی دەدات ناوە پیرۆزەكانی خوای گەورە لە سورەتەكەدا دەربهێنێت، ئینجا جەخت لەسەر ناوی (العلیم - زانا) بكاتەوە لە فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ (الملك: ١٣)

واتە: "چ بەنهێنی قسە بكەن، یان بەئاشكرا، ئەو زاتە زانا و ئاگایە بە هەموو ئەو ختوورە و خەیاڵاتانەی دێن بە كرۆكی سینەكاندا".

***

## (٧)

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار ئاماژەی (پێکەنین) چاپ دەکات، ئینجا پارچەپارچەی دەکات، دواتر داوا لە منداڵەکە دەکات پارچەکان بگەیەنێتەوە بە یەك و وێنەی پێکەنینەکە دروست بکاتەوە.



- پەروەردەکار ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ شی دەکاتەوە، کە دەفەرموێت: (**هیچ شتێکی چاکە بە کەم مەزانە، تەنانەت ئەگەر بە زەردەخەنەیەکەوە بگەیت بە براکەت**).[١] یاخود فەرموودەی: (**هەموو کارێکی باش خێرە، یەکێك لەوانە زەردەخەنە بەرامبەر براکەت**).[٢]

---

[١] موسلیم گێڕاویەتیەوە (٢٦٢٦).

[٢] تیرمزی گێڕاویەتییەوە (١٩٧٠)، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.

لە هەردوو فەرموودەکەدا گەورەیی هاندان هەیە بۆ ئەنجامـدانی کـاری بـاش، بـا کـەم و بچـووکیش بێـت، تەنانـەت لـە بەرامبـەر زەردەخەنەیەك لـە کـاتی بەیەکگەیشـتنی نێـوان دوو بـرادا، مـرۆڤ پاداشـت وەردەگرێـت وەك چـۆن لــە بەرامبــەر چـاکەدا پاداشـت وەردەگرێت.[1]

[1] ستایشکردن و مەدحکردنی رووگەشی و زەردەخەنە لە سـوننەتی پێغەمبـەر، ماڵپـەری (الدرر السنية).

## (٨)

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار لەگەڵ منداڵەکەی دەچێتە باخچە، پاشان لە مێرووڵە ڕادەمێنن، لە شێوە و قەبارەی، ئینجا لێی دەپرسێت:

- ئایا گوێت لە دەنگی مێرووڵەیە؟

.................................................................................

- قەبارەی مێرووڵەت بەلاوە چۆنە؟ (گەورە، مامناوەند، بچووك).

.................................................................................

- پەروەردەکار پەیوەندی دروست دەکات لە نێوان ناوە پیرۆزەکانی خوا (السميع - بیسەر، العليم - زانا، البصير - بینەر) و مێرووڵەدا، ئینجا داوای لێ دەکات وێنەی مێرووڵەیەك ڕەنگ بکات.

.................................................................................



## (٩)

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار منداڵەکە هان دەدات بۆ ئەوەی دەستەواژەیەك بۆ یەکێك لە کەسە نزیکەکانی، یان هاورێکانی بنووسێت و تێیدا چاودێریکردنی خوای گەورەی بیر بهێنێتەوە، ئەو زاتە دەیبینێت و ئاگاداری هەموو کردەوەکانییەتی، ئینجا نووسینەکە بکات بە کارتێکی دیزایینکراوی جوان و بەدیاری بیدات بە ئەو کەسە، یان دەکرێت کارتی ئامادەکراو بەکاربهێنێت، وەك ئەمانەی خوارەوە:



## دووەم: چالاکییەکانی تایبەت بە دوا قۆناغی منداڵێتی:

### (١)

پەرورەدگار دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴾ (العلق: ١٤)

لەم چالاکییەدا منداڵ گوێ لە پەروەردەکار دەگرێت کاتێك ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنێتەوە، پاشان پەروەردەکار ئایەتەکە تەفسیر دەکات و شیکردنەوەی بۆ دەکات (واتای ئایەتەکە: ئایا ئەو کەسەی ڕەتکراوەی ڕێی هیدایەت - کە ئەبو جەهلە - نازانێت، کە خوای پەروەردگار دەیبینێت و گوێی لە قسەکانییەتی و بە توندترین شێوە سزای کردەوەکانی دەداتەوە؟)[1] ئینجا واتای ناوی پیرۆزی (البصیر - بینەر)ی بۆ شرۆڤە دەکات وەك ئەوەی لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هاتووە. دواتر منداڵەکە ئایەتەکە بە شێوازێکی جوان بنووسێت بە یەکێك لە بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و نەخشەسازی و ڕەنگی بکات، وەك بەرنامەکانی فۆتۆشۆپ، یان وێنەکێشان، یان پاوەرپۆینت، یان هەر بەرنامەیەکی تر" ئینجا یان بیکاتە پاشخانی مۆبایلەکەی، یان کۆمپیوتەرەکەی، یان بە هاوکاریی پەروەردەکارەکەی چاپی بکات و بیکات بە لەزگە و لە کتێبەکانی قوتابخانەی بدات.

***

---

[1] تەفسیری ئیبن کثیر، بەرنامەی (آیات).

(٢)

پەروەریدەکار ئەم ڤیدیۆیەی خوارەوە نمایش دەکات



ئینجا پەروەردەکار داوا لە منداڵەکە دەکات ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە دەربهێنێت، کە لە ڤیدۆکەدا هاتوون، پاشان کەمێك لەسەر واتای ناوی پیرۆزی (الرقیب - چاودێر) بوەستێت، وەك ئەوەی لە بەشی یەکەمدا هاتووە:

..............................................................

..............................................................

..............................................................

..............................................................

..............................................................

..............................................................

.........................

❊ ❊ ❊

(٣)

لــەم چــالاکییەدا پــەروەردەکار ئــەم چــیرۆکە دەخوێنێتــەوە: (دەگێڕنەوە مامۆستایەکی بەتەمــەن، قوتابییــەکی گــەنجی هــەبوو، بەردەوام ڕێزی دەگرت و پێشی خۆی دەخست، هەندێ لە هاوڕێکـانی پێیان وت: چۆن بەم شێوەیە ڕێزی ئەمە دەگریت، لـە کاتێکـدا ئـەو گەنجە و ئێمەیش پیر؟!

ئینجا مامۆستا بەتەمەنەکە هەندێ باڵندەی هێنا، باڵندەیەك و چەقۆیەکی بە هەریەك لە هاوڕێکانی دا و پێی وتن: بـا هەریـەکێك لە ئێوە ئەم باڵندەیە سەربڕێت، بەڵام لە شوێنێکی ئەوتۆ، کە هـیچ کەس نەیبینێت.

بــە هــەمان شــێوە باڵندەیــەك و چەقۆیەکیشــی دا بــە دەســتی گەنجەکەوە و هەمان شتیشی بەو وت، پاش ماوەیەك هــەموویان بــە باڵندەی سەربڕاوەوە گەڕانەوە، جگە لە گەنجەکە، کە باڵندەکەی هــەر زینــدوو بــوو. مامۆســتاکە پێــی وت: چــیتە، بۆچــی وەك ئــەوانیتر باڵندەکەت سەرنەبڕی؟ لە وەڵامدا وتی: هیچ شــوێنێکم نەدۆزییــەوە کەس تێیدا نەمبینێت، لە هەموو شوێنێك خــوای گــەورە ئاگـاداری من و بینەرم بوو... پاشان مامۆستا بەتەمەنەکە وتــی: لــە ئــەوەوە

فێری چاودێریکردن بن. ئینجا وتیان: بەڕاستی شایەنی ئەو ڕێزگرتنەیە).[1]

دواتر لە منداڵەکە بپرسێت لەم چیرۆکەدا چ شتێك سەرنجی ڕاکێشاوە؟ داوای لێ بکات چیرۆکەکە ببەستێتەوە بە چەند هەڵوێستێکەوە، کە لە ژیاندا بیستوونی:

..........................................................

..........................................................

..........

- **تێبینی:** کاتێك چیرۆکەکە دەخوێنیتەوە، سووربە لەسەر ئەوەی ئاوازی دەنگەکەت بەگوێرەی جیاوازیی ڕووداوەکان گۆڕانی بەسەردا بێت، تەنانەت خێرایی قسەکردن بەگوێرەی ڕووداوەکان بگۆڕێت" ئەو ڕووداوانەی گرنگ نین بەخێرایی بەسەریاندا بڕۆ، بەڵام ئەوانەی گرنگن، زۆر بەهێواشی بەسەریاندا بڕۆ.

***

[1] سەیری (الأسرة المسلمة ومهمتها في تنمية الرقابة الذاتية لدى الطفل،) بکە، (لا ٧٩).

**(٤)**

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار ئەم چەند کارتانەی خوارەوە نیشانی منداڵ دەدات، ئینجا داوای لێ دەکات بیریان لێ بکاتەوە و هەوڵ بدات ڕستەی واتاداریان لێ دروست بکات، پێویستە پەروەردەکار سەرجەم هەوڵەکانی منداڵەکە وەربگرێت، تا دەگاتە پێناسەی دروستی خۆچاودێریکردن" ئینجا گفتوگۆی لەگەڵ بکات:

(... هەست بە چاودێریی خوا بکات، داوا لە کەسێك دەکەین، بۆ بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا و پاداشتی ئەو، بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە، هەڵقوڵاو لە ئیمانەوە، دوورکەوتنەوە لە کاری خراپە لە ترسی سزا، هەستێکی ناو ناخە، ئاگادارە بە سەرجەم کارەکان...)

..............................................................

..................................................................

..................................................................

..................................................................

..................................................................

..................................................................

.............................

***

(٥)

لەم چالاکییەدا پەروەردەکار پرسیار لە منداڵەکان دەکـات ئـەو هۆکارانە چین، کە یارمـەتیی خۆچـاودێریکردن دەدەن؟ پاشـان داوای ئامادەکردنی (گۆڤاری دیـواری، ڕاپـۆرتی دیواری)یـان لـێ بکـات. باشترە ئەرکەکان لەسەر منداڵەکان دابەش بکـات، تـا ئـەم ڕاپۆرتـە ئامادە بکەن، سەرجەم پێداویستییەکانیشیان بخاتـە بەردەسـت وەك: (ڕەنگ، مەقەست، ڕاستەهێلی گەورە، قەڵەمی جۆراوجۆری ماجیـك و... هتد) لە کۆتاییدا کارەکـەیان لـە چوارچـێوەی تابلۆیەکـدا لـە شوێنێکی دیاری ماڵەکە هەڵدەواسرێت:

❊ ❊ ❊

(٦)

لەم چالاکییەدا گـوێ لـەم سـروودەی خـوارەوە دەگـرن، ئینجـا پەروردەکار پرسیار لە منداڵەکـە دەکـات، کـە چـۆن هـاوڕێی بـاش دەبێتە هۆکارێك بۆ هەسـتکردن بـە چـاودێریکردنی خـوا؟ سـیفەتی هاوڕێی باش چییە؟



❊ ❊ ❊

## (٧)

پەروەردەکار پرسیار لە منداڵەکەی دەکات: ئایا دەکرێت نەبوونی خۆچاودێریکردن هۆکارێك بێت بۆ ئەمانە:

- ملکەچنەبوون لە نوێژدا؟
- دڵڕەقی بەرامبەر ئاژەڵان؟
- ئازاردانی ئەوانیتر؟
- دواکەوتن لە قوتابخانە؟

پاشان ئەو هۆکارانەی بۆ باس بکات، کە پێویستە مرۆڤ ئەنجامیان بدات، بۆ ئەوەی بەرامبەر ئەم کارانە چاودێریی خۆی بکات.

*** 

## (٨)

(پەنجەکان قسە دەکەن) پەروەردەکار داوا لە منداڵەکان دەکـات، هەریەکەیان وێنەی دەستی خۆیان لەسەر پەڕەیەك بکێشـن و پاشـان بیانڕازێننەوە و ڕەنگیان بکەن، دواتـر نیشـانەکانی هـاوڕێی خـراپ بنووسێت، ئینجا هەریەکێك لە پەنجەکان باس لە ڕێگەیەك بکات بۆ خۆدوورخستنەوە لێی.





## (٩)

گوێگرتن لە شەرحی فەرموودەی (چاکە)، ئینجا پەروەردەکار ڕێگەی (بیرکردنەوەی مێشك) بەکاربهێنێت، تێیدا داوا لە منداڵ بکات هەرشتێك بە خەیاڵیاندا دێت لە بیرۆکە و فیکرە، بە شێوەی خاڵبەندی و خێرا بینووسن.



❊ ❊ ❊

(١٠)

پەروەردەکار ڤیدیۆی (هاوکاریکردن) و (ئەمانەتپارێزی) نیشان دەدات:



ئینجا پەروەردەکار گفتوگۆ بکات لەگەڵ منداڵەکان، داوایان لێ بکات هەریەکەیان تابلۆیەك ئامادە بکات و لەسەری بنووسێت: (بۆم دەرکەوت...) ئینجا دابەشی بکات بۆ دوو بەش و بنووسێت:

- بۆم دەرکەوت: ئەو ڕەفتارانەی بە چاو بینیمن چین، کە پەیوەندییان بە خۆچاودێریکردنەوە هەیە.
- بۆم دەرکەوت: ئەو ڕەفتارانەی بە گوێکانم بیستومن چین، کە پەیوەندییان بە خۆچاودێریکردنەوە هەیە.

دەکرێت لەم ڕووەوە یارمەتیی منداڵەکان بدرێت.

***

## (١١)

پەروەردەکار ئەم هەواڵە ڕۆژنامەوانەییە نیشانی منداڵ دەدات:

**هەواڵ: دەستگیرکردنی باندێکی دزینی ماڵان**

دوای ئەنجامدانی چەندان تـاوانی دیزیکـردن، پۆلیسـی پارێزگـای هـەولێر باندێکی دزیی دەستگیرکرد، کە پێکهـاتبوون لـە چـەند کەسـێکی بیـانی بـە هاوکاریی چەند کەسێکی ناوخۆیی.

وتەبێژی پۆلیسـی هـەولێر ڕایگەیانـد، کـە توانیوویانـە گرووپێکـی دزی ئاشکرا بکەن، کە پێکهاتبوون لە دوو بیانی و چوار کەسی نـاوخۆیی، تەمــەنی سێ کەسیان لە بیست ساڵی و سـی سـاڵیدا بـوون، لەگـەڵ نەوجـەوانێکی ١٥ ساڵی و دوو ئافرەتی ناوخۆیی.

ئاماژەی بەوەدا ڕووداوی دەستگیرکردنەکە دوای ئەوە هات، کە ژمارەیەك ماڵ لە شاری هەولێر لە گەڕەکی جیاجیا ڕووبەڕووی دزیلێکردن بوونەوە، دواتـر کەسانی پسپۆر لە پۆلیس دەستیان کـرد بـە لێکۆڵینـەوە لـە ڕووداوەکـە، لـە ئەنجامی گەڕان و لێکۆڵینەوە لە شوێنی ڕووداوەکـان و کۆکردنـەوەی سـەرجەم بەڵگە پێویستەکان لەسەر تاوانەکە" بە پشتیوانیی خوا و سـەرکەوتنی پیـاوانی پۆلیس توانرا گومانەکان سەبارەت بەم گرووپەکە کۆبکەینـەوە و لـە کۆتاییـدا دەستگیریان بکەین.

وتەبێژی پۆلیس ڕوونیشی کـردەوە باندەکـە کارەکـەیان لـە نێـوان خۆیـان دابەش کردبوو، بەشێکیان چاودێریی ماڵەکانیان دەکرد بەر لە دزیکردن، پاشان ژمارەیەکیان هەڵدەستان بە دزیکردن لە ماڵەکان و دزینی زێڕ و زیـو و پـارە و

شتی گرانبەها، دواتر ئەو کەلوپەلانەیان بە شێوازی جیاجیا ساغ دەکردەوە، کە دوای دەستگیرکردنیان ئاشکرا بوو. لە هەمان کاتدا لە کاتی دەستگیرکردنیاندا توانرا دەست بەسەر بڕێك زێڕ و پارە و کەلوپەلی گرانبەهادا بگیردرێت، دواجار تومەتباران و دۆسییەکانیان ڕەوانەی دادوەری گشتی کران.

پاشان داوایان لێ بکرێت جڵەوی خەیاڵکردنیان شل بکەن: چۆن هاوکاریی پیاوانی پۆلیس دەکەن؟ چی دەبێت، ئەگەر یەکێك لە ئێوە خاوەنی ماڵێك بێت، کە دزیی لێ کرابێت؟ چۆن هەڵسوکەوت دەکات و هەستی چی دەبێت؟ ئایا ئەم ڕووداوە پەیوەندیی بە خۆچاودێریکردنەوە هەیە؟ چۆن دەتوانرێت ئەم کێشەیە بە هاوکاری لەگەڵ خاوەنی ماڵە دزیلێکراوەکاندا چارەسەر بکرێت؟

*** 

(١٢)

پــەروەردەکار داوا لــە منداڵــەکان دەکــات پێشــنیارەکان بــۆ مەبەستی بڵاوکردنەوەی بیرۆکــەی خۆچــاودێریکردن لــە کۆمەڵگــەدا بنووسن، لە شـێوەی (کــارت، نووسـینی دەسـتەواژەی جۆراوجـۆر و ڕازاندنەوەیان)، پاشان لە کۆبوونەوەیەکی خێزان، یان لەناو مزگەوت، یان لەناو خەڵکی گەڕەك، یاخود قوتابخانەدا دابــەش بکرێـت" بــەڵام دەبێت پێداویستییەکانی ئەم بابەتەیان لەبەردەست بێت.





## (١٣)

لەم چالاكییەدا پەروەردەكار داوا لە منـداڵ دەكـات نامەیـەكی دەسـتی بـۆ هاوڕێیـەكی بنووسـێت، كـە لـە هەڵوێسـتێكیدا خۆچاودێریكردنی ئەنجام نەداوە، تێیدا واتـای خۆچـاودێریكردنی بـۆ ڕوون بكاتەوە و ئەوەیشی، كە چۆن بتوانێت لە ڕووداوی هاوشـێوەدا“ ئەم چاودێریكردنە لەسەر خۆی جێبەجێ بكات؟



***

لە کۆتایی چالاکییەکاندا دەکرێت پەروەردەکار گەشتێك، یان پیاسەیەك، یاخود ئاهەنگێکی خنجیلانە لە ماڵەوە بە هاوکاریی منداڵەکان ئەنجام بدات، لەمیای ئاهەنگەکەدا دیاری بەسەر هەموان دابەش بکرێت. دەکرێت وێنەی خۆیان لەسەر ئەو چالاکییانە بێت، کە ئەنجامیان داوە و ئینجا نمایش بکرێن“ هەروەها دەکرێت بڕوانامەی ڕێزلێنانیان پێشکەش بکرێت، با پەروەردەکار شیرینی و خواردنی بۆنە و ئاهەنگەکەی لە بیر نەچێت بەو شێوەیەی، کە دڵی منداڵەکان خۆش دەکات.

- سەرجەم چالاکییەکان لە یەك فایلدا کۆکراونەتەوە، تا بتوانرێت چاپ بکرێت، یان لەم لینکەی خوارەوەدا دابەزێنرێت.



***

# بەشی سێیەم
# پرسیار و کێشە واقیعییەکان

## • کچەکەم و شوێنەواری خۆچاودێریکردن

**پرسیار:**

≡ کچەکەم تەمەنی ٩ساڵانە، ماوەی نزیکەی دوو هەفتەیە هەوڵی بەهێزکردنی خۆچاودێریکردنی لەگەڵ دەدەم، بەڵام هیچ شوێنەوارێکی ڕوونی لەسەر نابینم. بۆچی؟

**وەڵام:**

ئەی دایکی دڵسۆز! ئایا درەختی (حەیزەران)ت بینیوە؟ دەزانیت چۆن دەچێنرێت؟ دەزانیت چەند کاتی دەوێت، تا گەشە دەکات و جووتیارەکەی بەرهەمەکەی دەچنێتەوە؟

یەکێکە لە درەختە بەناوبانگەکانی وڵاتی چین، سەرەتا جووتیارەکە زەوییەکەی بۆ ئامادە دەکات، پاشان تۆوەکەی دەچێنێت و هەموو ڕۆژێك ئاوی دەدات، ئەگەر پێویستی بە گۆڕینی پەین بێت بۆی دەگۆڕێت" بۆ ماوەی ساڵێك ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە کەچی هیچ شتێك نابینێت! دواتر بۆ ساڵی دووەم و سێیەم و چوارەمیش بە

هەمان شێوە، جووتیارەکە بۆ ماوەی چوار ساڵ گرنگیی پـێ دەدات، کەچی هیچ بەروبوومێك نابینێت، تا ساڵی پێنجەم دێت و چـرۆیەکی بچووك دەردەکات، ئینجا دوای شـەش ڕۆژ درێژییەکـەی (٩٠ سـم) زیاد دەکات... بە هەمان شێوە بۆ ئەو بەهایـە - لێـرەدا مەبەسـتم خۆچاودیرێکردنە - گومانی تێدا نییە، کە پێویستی بە ئارامگرتن و بەتەنگـەوەهاتن و ئاگـاداربوون و ڕەنجـدان و پشتبەسـتن بـە خـوا و پاڕانەوە و بەرگەگرتنی هەڵـەی منـداڵ هەیـە، (هـەمووومان خـاوەن هەڵەیەن) ئەمە سروشتی مرۆڤە.. بە پشتیوانیی خوا ئەو ڕۆژە دێت، کە بەرهەمی چاندنەکەت ببینیت. ئینجا دوای ماوەیەك لە ڕاهێنان، ئاسـتی هۆشـیاری و هەسـتپێکردن و زانـینی منداڵەکـەت بـە خۆچاودێریکردن دەبینیت، کە خـۆت فێـرت کـردووە، دەتوانیـت بـۆ خۆت هەست بەمە بکەیت، بۆ نموونە: کاتێك پرسیاری لەبارەی مانای خۆچاودێریکردنەوە لێ دەکـەیت، یـاخود لێـی بپرسـیت ئایـا هـیچ هەڵوێسـتێکت بینیـوە لـە خـۆت، یـان هاوڕێکـەت، کـە بابـەتی خۆچاودێریکردنی تێیدا دەرکەوتبێت؟ هەروەها پرسیاری هاوشـێوە.. دوای ئەمە دەتوانیت چاودێریی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی بکەیت، کە ئایا ئەم زانیارییـەی هەیـەتی جێبـەجێی دەکـات؟ گـەر هیچـت نەبینی، نائومێد مەبە، چونکە ئـەم کـارە وەکـو باڵاخانەیـەك وایـە لەسەر ڕەنجدان و ئارامگرتن خۆی دەگرێـت. تـۆیش مامەڵـە لەگـەڵ

منداڵێکدا دەکەیت، کە دە ساڵی تێپەڕ نەکردووە، هەندێ جار دەرك بە شتەکان دەکات و هەندێ جاریش دەرکیان پێ ناکات، هەندێ جار بیری دێتەوە و جاری وایش هەیە بیری دەچێت. تێبکۆشە و ڕەنج بدە و دەست بە هۆکارەکانەوە بگرە، خوای گەورەیش پشتوپەنایە.

***

## • کەللەڕەقی و سەرکێشیی کوڕەکەم ڕێگرە لەبەردەممدا

≡ منداڵەکەم بە (خوا) دەترسێنم، تا دووربکەوێتەوە لەو شتانەی خوا پێیان ناڕازییە، بەڵام لەگەڵیدا ڕووبەڕووی تووڕەیی و کەللەڕەقی دەبمەوە" چۆن بتوانم خۆچاودێریکردن لە لای بەهێز بکەم لە کاتێکدا ئەو سیفەتانەی هەیە، کە زۆر عینادیم لەگەڵ دەکات و تووڕەییەکەی بێزارم دەکات؟

**وەڵام:**

دایکی ئازیز! هەوڵ و ماندووبوونەکانت بۆ بەهێزکردنی خۆچاودێریکردنی منداڵەکەت و دوورخستنەوەی لە تووڕەیی خوا، بەرز دەنرخێنم، بەڵام سەرەتا پێویستە خۆت بەدوور بگریت لە ترساندنی منداڵەکەت بە خوا، یان زۆری لێ بکەیت لەم بابەتەدا. بە تووڕەیی مەیترسێنە، ئەگەر سەرپێچیی کرد، چونکە ئەم کارە ئازاری دەدات، ئەویش تۆڵە دەکاتەوە و لە دەرئەنجامدا بەفەتارەت دەچێت"

بەڵکو پێویستە سەرەتا خۆشویستنی خوای فێربکەیت، چونکە کەسێك خوای خۆش بوێت، لە ئەنجامدا شکۆی ئەو زاتەی لە پەنهان و ئاشکرادا لە لا دروست دەبێت، ئینجا لە پەرستنیدا تاموچێژ و بەختەوەری دەبینێت، چونکە خوای پەروەردگار لەگەڵیدا دەبێت و دەیپارێزت و چاودێریی دەکات. هەرکەسێك خوای خۆش بوێت، سووردەبێت لەسەر بەجێگەیاندنی نوێژەکانی و خوێندنی قورئان و پەرستشەکانی تر، سەرئەنجام منداڵ هەست بە ئاسوودەیی و دڵنیایی دەکات دوور لە شپرزەیی و نیگەرانی. دوای ئەم کارە، ئەگەر بە لای بابەتی (ئاگر، دۆزەخ)دا تێپەڕی، پێویستە بەپەلە و بێ جەختکردنەوەی زۆر بەسەریدا بڕۆیت، ئەمەیش بێگومان دەبێت دوای ئەوە بێت، کە منداڵەکەت بەجوانی فێری خۆشویستنی خوای پەروەردگار کردبێت.

ئێستا با بچینە سەر تووڕەییەکەی، لێرەدا باس لە هەندێ هۆکار دەکەین، تۆ خۆت دەتوانیت ئەو هۆکارە دیاری بکەیت، کە بووەتە هۆی تووڕەیی منداڵەکەت:

- لەوانەیە هۆکارەکە ئازار و موعاناتی باوکەکە بێت لەگەڵ تووڕەیی و ڕقئەستووریی خۆی، یان لەوانەیە دایك لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکاندا هەڵچوو و تووڕە بێت، یاخود لەوانەیە زاڵبوونی دایکەکە بەسەر منداڵەکەدا ببێتە سەرچاوەی تێکشکانی، ئینجا بە هەموو توانایەکییەوە بەرامبەری دەوەستێتەوە. لێرەدا منداڵ کەللەڕەقی و عینادی لە دایك و باوکییەوە وەردەگرێت.

– کاتێك نازپێدانی زۆر بە منداڵەکە و زیادەڕۆیی لە پارێزگاریلێکردنی دەبێتە باو، ئەوکات دەبێتە هۆی تووڕەیی و ڕقئەستووری. ئەو فێر بووە، کە دەبێت پێویستییەکانی بەبێ دواکەوتن بۆ جێبەجێ بن، گەر بۆیشی جێبەجێ نەبن، ئەوە هەڵدەچێت و تووڕە دەبێت.

– لەوانەیە بەدەست لاوازیی ئاستی عەقڵییەوە بناڵێنێت، ئەوکات هەست بە فشاری دایك و باوکی دەکات لەسەری، تا کارەکانی بەجوانی ئەنجام بدات و زیاد لە توانای خۆی باری قورس دەکەن، لەسەر هەموو هەڵەیەك سەرزەنشتی دەکەن، یاخود بەپێچەوانەوە" ئەوکاتەی ئاستی عەقڵیی منداڵەکە بەرزە، لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆی لە شێوازی بیرکردنەوەدا جیادەبێتەوە، زوو تێدەگات و خێراتر و دووربینترە لە کەسانی تر، حەز بە دووبارەکردنەوە ناکات، پرسیاری زۆر دەکات لەوانەیە ڕووبەڕووی گاڵتەپێکردن و پشتگوێخستن ببێتەوە" لە ئەنجامدا تووشی دڵتەنگی و تێکشکان دەبێت و ئەمەیش سەردەکێشێت بۆ کەللەڕەقی و تووڕەیی.

– لەوانەیە منداڵ هەست بکات تەشقەڵەی پێ دەکرێت و بەسووك سەیر دەکرێت، هەست بە خۆشەویستی نەکات لە نێوان خێزانەکەیدا.

– لەوانەیە کێشەکە تەندروستی بێت، وەك کەمیی ڤیتامین

(D)، یاخود تێکچوونی ڕژێنەکانی (دەرەقی)، یان کـەمیی مـاددەی ئاسن و کەمخوێنی، یان دواکەوتنی قسـەکردن. لەوانەیشـە بەدەسـت خراپـی و تێکچـوونی خـەوی بناڵێنێـت، درەنـگ بخـەوێت و زوو هەڵبستێت!

دوای دەستنیشـانکردنی هۆکـاری تووڕەییەکـەی، ئینجـا ڕۆڵـی چارەسەرکردن دێت، ئەگـەر هۆکارەکـە تەندروسـتی بێـت، ئـەوکات دەبێت سەردانی پزیشك بکرێت و چارەسـەر وەربگرێـت" خـۆ ئەگـەر ئەمەیش نەبوو، ئەوە چارەسەرەکان بەم شێوەی خوارەوەن:

– دروستکردنی کەشێکی ئارام و بەختەوەریی بێ ژاوەژاو لەناو ماڵ.

– ڕەخساندنی دەرفـەت بـۆ منـداڵ بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ کەسـە نزیکەکانیـدا کـاری بەکۆمـەڵ بکـات، هـەروەها پێـدانی ئـازادیی هەڵسوکەوتکردن لە کاروبارە تایبەتییەکانیـدا بـەگوێرەی پێویسـت، بەڵام بەپێی ڕێنمایی و ئاراستەکردنی.

– دوورکەوتنەوە لە شێوازی سووك سەیرکردن و ڕقلێبوونەوە لە منداڵ، لێی بگەڕێ با خۆی گوزارشت لە هەست و سۆزەکانی بکات.

– ڕێکخستنی کاتەکانی خەوتنی منداڵ، بۆ ئەوەی کاتـەکانی خەوی بەتەواوەتی وەربگرێت. پێداگر بیت لەسەر ئـەوەی شـەوان زوو بخەوێت، بۆ ئەم مەبەستەیش دەکرێت لە ئامێری بگرێـت و چـیرۆکی جۆراوجـۆری بـەر لـە خـەوتنی بـۆ بخوێنیتـەوە، وەك ئـەوەی باسـی

منداڵێکی هێمن و ئارامی بۆ بکەیت، کە لە هەمان تەمەن و تایبەتمەندی و ژینگەی ئەودایە" بۆ ئەوەی منداڵەکەت خاسیەتی کەسایەتیی ئەو منداڵە ئارام و هێمنە وەربگرێت.

– لە کۆتاییدا دایك و باوك ببنە پێشەنگێکی نموونەیی بۆ ئەوەی منداڵەکەیان فێر بکەن چۆن بتوانێت بە هێواشی و شێنەیی و دوور لە توورەیی و هەڵچوون مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکاندا بکات و ڕووبەڕووی کێشەکان بوەستێتەوە.

بەڵام سەبارەت بە کەللەڕەقی و عینادیی منداڵەکەت، بەگشتی منداڵان سیفەتی (خۆسەلماندن)یان هەیە، ئەمەیش دوای ئەوەی دەگاتە ساڵی دووەمی تەمەنی، یەکێك لە نیشانەکانی (عینادی) ئەو زەمانەیە، کە منداڵ بۆ بە دەستهێنانی سەربەخۆییەکەی بەکاری دەهێنێت، بەوپێیەی لە پشتبەستن بە دایکییەوە دەچێتە قۆناغی پشتبەستن بە خۆی. زانایان دەڵێن ئەو منداڵەی بەو قۆناغەدا ناڕوات، کە کەسایەتی و خودی خۆی بسەلمێنێت، ئەوا منداڵێکی ئاسایی نییە.

لە سوودەکانی (عینادی)ی ئەم قۆناغە ئەمانەیە:

– یارمەتیی منداڵ دەدات لە دۆزینەوەی کەسایەتی و سەربەخۆیی خۆی.

– منداڵ دەتوانێت لەمیانەیدا هەست بکات، کە کیان و کەسایەتیی سەربەخۆیی تایبەت بە خۆی هەیە، دوور لە هی کەسانی تر.

– ئیرادەی ئازادیی خۆی دەدۆزێتەوە، دواتر سیفەتی سەربەخۆبوون لە دەوروبەریدا بەدەست دەهێنێت.

بەڵام، تا منداڵ لەم قۆناغەدا بە سەلامەتی تێپەڕ دەبێت، پێویستە لەسەر دایکان و باوکان ئارام بگرن و لە منداڵەکەیان تێبگەن، لە تێپەڕینی ئەم قۆناغەدا یارمەتیی بدەن، گەر دایك بە زەبروزەنگەوە مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیدا بکات" ئەوانیش لاسایی دەکەنەوە، پاشان پەنا دەبەنە بەر کەللەڕەقی (عینادی).

بۆ ئەوەی کێشەی (عینادی)ی منداڵەکەت چارە بکەیت، پێویستە ئەم کارانە بکەیت:

– زۆر جەخت لەسەر ئەم سیفەتە مەکەرەوە، بەڵکو سەرنجی خۆت بخەرە سەر ڕەفتارە ئەرێنییەکانی منداڵەکەت.

– لە کاتی نواندنی هەڵوێستی عینادی، ئارامی و هاوسەنگیی هەڵچوونی خۆت بپارێزە، فێری هونەری پاشەکشێی ئەرێنی ببە لە مەیدانی جەنگە سادە و بێماناکانی ڕۆژانەدا.

– خۆت گێل بکە لە هەندێ هەڵسوکەوتی منداڵەکەت، کە کەللەڕەقی و عینادییان تێدا دەردەکەوێت، کە منداڵ دەیەوێت لەمیانەیاندا خۆی بسەلمێنێت. کاتێك منداڵێکی پێنج ساڵان خواردنێك ڕەت دەکاتەوە و خۆی دەدات بە زەویدا، دوای ماوەیەك، کە زانیی کەس بە دوای داواکەیەوە ناچێت، هەڵدەستێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر خواردنەکەی و دەکەوێتە خواردنی.

– بەجێگەیاندنی داواکاری منداڵەکە بە شێوەیەکی هاوسەنگ، ئەمەیش وای لێ دەکات هەست بە منەتباری بکات بەرامبەر دایك و باوکی، بە هەمان شێوەیش مامەڵە دەکاتەوە.

– منداڵ پێویستی بە هەستی خۆشەویستی و گرنگیپێدان هەیە، ڕۆژانە بەشێك لە کاتی خۆتی پێ بدە (لانیکەم دە خولەك)، گاڵتەوگەپ و یاریی لەگەڵ بکە و لێی بپرسەوە. ئەم پەیوەندییە وا دەکات منداڵ کەمتر ئەو شتانە ڕەت بکاتەوە، کە تۆ داوای لێ دەکەیت.

– داوا و وتارەکانت بۆ منداڵەکەت بە نەرمونیانی و ڕوونی و عەزم و جەزم بێت، ئەمە ڕۆحی هەڵچوون و بەرگری و عینادی منداڵەکە کەم دەکاتەوە، بۆ نموونە: پێی بڵێیت: "خۆشەویستەکەم! بێزەحمەت پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنە".

– ڕوونکردنەوەی هۆکاری فەرمانەکان، ئەم جۆرە کارە کەرامەت و شکۆی منداڵەکە دەپارێزێت و ڕەچاوی هەست و شعووری دەکات، پاڵپشتیی دەکات بۆ ئەوەی هۆکاری ڕووداوەکان بزانێت. دەزانێت، ئەگەر کارێك ئەنجام نەدات چ زیانێکی دەبێت، بەپێچەوانەیشەوە دەزانێت، ئەگەر ئەنجامی بدات چ سوودێکی دەبێت.

– دوورکەوتنەوەی لە ڕاسپاردنی منداڵ، تا کارێك بکات لە کاتی بوونی ناکۆکیدا، بەڵکو دەبێت ئەو ڕاسپاردنە لە کەشێکی

ئارام و دانیشتنێکی گفتوگۆئامێزدابن.

- منداڵەکەت لە گۆشەیەکی تەسکدا قەتیس مەکە، کاتێك بە شێوەی زەبروزەنگ و خێرایی داوای لێ بکەیت کارێك بکات، بێ ئەوەی بوارێکی پێ بدەیت، یان بژاردەیەکی تری بخەیتە بەردەم" یاخود گفتوگۆ، یان ڕاوێژی پێ بکەیت. لەم جۆرە حاڵەتانەدا کەللەڕەقیی منداڵەکە شتێکی چاوەڕوانکراو دەبێت، بەڵام باشترە داواکە بەم شێوەیە بێت: حەزت لێیە ئێستا ئەم کارە بکەیت، یان دوای دە خولەکی تر؟

لەمیانەی ئەو چارەسەرییانە و خۆرزگارکردن لە شێوازی مامەڵەی هەڵە لە بواری بەهێزکردنی خۆچاودێریکردندا، وا باشترە لەگەڵیدا ئەو چالاکییانە جێبەجێ بکەیت، کە لەم کتێبەدا هەن. هەروەها بگەڕێ بزانە هیچ بەربەستێك هەیە ڕێگری لە ڕاپەراندنی کارەکەت بکات؟ نزا و پاڕانەوەیشت بیر نەچێت، ئەمە چەکی تۆیە.. خوای پەروەردگار سەرکەوتووت بکات و لە پەروەردەکردنی منداڵەکەتدا هاوکاریت بکات.

***

## • شەرمنیی کچەکەم و دەستەخوشکەکانی:

**پرسیار:**

**≡ کچەکەم زۆر شەرمنە، نازانێت پارێزگاری لە دەستەخوشکەکانی بکات، زۆر لەوە دەترسێت دەستەخوشکەکانی کاتێك هاوڕێیەکی تازە دەناسن، دەستبەرداری ئەو ببن. چۆن وای لێ بکەم هاوڕێی باش پەیدا بکات و هاوڕێیەتییان بەردەوام بێت؟**

**وەڵام:**

نیشانەکانی شەرمنی بە واتا ڕاستەقینەکەی، گەلێك زۆرن (شەرمنی پلەیەك لە: ترس، گۆشەگیری و پەشۆکاوی بەرزترە، بەتایبەت کاتێك منداڵ دەگاتە کەسێکی دەرەوەی خێزانەکەی)، ئەویش بەم شێوەیە:

– بەگوێرەی توانا، خۆی لە بینینی خەڵکی دەشارێتەوە، خۆی بەدوور دەگرێت لە گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسانی نامۆ، یان سەیرکردنی چاویان.

– چالاکیی منداڵ و کرانەوەی منداڵی شەرمن لە چوارچێوەی خێزاندا دەمێنێتەوە، گۆشەگیر دەبێت، تەنانەت لەوانەیە دەموچاوی خۆی بە دەستی داپۆشێت، تا کەس نەیبینێت.

– بڕوابەخۆبوونی کەمە، لە بەرامبەر ئەنجامدانی هەر کارێکدا دوودڵە، حەز لە دەستپێشخەریی کاری چاکە ناکات.

– منداڵ لە خستنەڕووی پرسیاری زانستیدا هەست بە زەحمەتی دەکات، لە وەڵامدانەوەی پرسیاری خەڵکییش هەست بە زەحمەتی دەکات.

– ناتوانێت کێشە قورسەکان چارەسەر بکات، بەهۆی ئەو پەشۆکاوییەی هەستی پێ دەکات ناتوانێت بەجوانی گوزارشت لە خۆی بکات.

– زۆر بەدەگمەن کێشە و ئاڵۆزی دەنێتەوە، بەکەمی قسە دەکات، گەر قسەیش بکات دەنگی نزم دەبێت.

– بەهۆی شەرمنییەوە لە چوونە ناو یاریی بەکۆمەڵ هەست بە زەحمەتی و دژواری دەکات، بۆیە ئەزموونی کەم دەبێت، تەنیا ژمارەیەکی کەم هاوڕێی هەیە.

بەهۆی شەرمنییەوە، کچەکەت ناتوانێت بەئاسانی هاوڕێ پەیدا بکات، گەر هاوڕێیشی هەبێت ناتوانێت لەگەڵی بەردەوام بێت.

هەندێ هۆکاری شەرمنی هەن، لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین:

– پێویستبوون بە کەشێکی ئارام، منداڵ کاتێك تێکەڵی خەڵك دەبێت پێویستی بەوەیە، کە هەست بکات پارێزراو و ڕێزلێگیراوە و دەتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت“ ئینجا دەتوانێت پەیوەندی

لەگەڵ کەسانی تردا ببەستێت، بەڵام کاتێك حاڵەتی ترس زاڵ دەبێت بەسەریدا، ئەوکات هەست دەکات گۆشەگیری باشترین چارەیە.

- ناکۆکیی بەردەوامیی نێوان دایك و باوك.

- پشتگوێخستنی دایك و باوك بۆ منداڵەکەیان و سەرقاڵ نەبوون پێیەوە، لە دواییدا منداڵ هەست بە شەرم دەکات و وا دەزانێت شایەنی گرنگیپێدانی کەسانی تر نییە، ئەمەیش پاڵی دەنێت بۆ ئەوەی کەنارگیر بێت و لە بەشداریکردن لەگەڵ خەڵکانی تر بترسێت.

- پاراستنی لە ڕادەبەدری دایك و باوك بۆ منداڵەکەیان، کە لە بەرامبەر هەموو شتێکدا چاویان لەسەریەتی، حەزیان لێیە بەردەوام لە لایان بێت، منداڵەکە وا لەم جۆرە هەڵسوکەوتە تێ دەگات: (تۆ ناتوانیت بەرپرسیارێتییەکان هەڵبگریت، یان بەرگرییان لێ بکەیت، بۆیە ئێمە لەبری تۆ ئەم کارە دەکەین)، ئیتر ئەویش لەسەر بنەمانی ئەم تێگەیشتنە هەڵسوکەوت دەکات.

- ڕووبەڕووکردنەوەی منداڵ بە ڕەخنەی توند و سەرزەنشتکردن، لە دەرئەنجامدا ڕقلێبوونەوە لە خۆی و تێکشکان سەرهەڵدەدات، ئەوەیش پاڵی دەنێت بۆ شەرمنی.

- لەوانەیە دایك، یان باوك شەرمن بێت، ئەم سیفەتەیش دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ.

پشت بە خوا ببەستە و هۆکاری شەرمنی منداڵەکەت دیاری بکە،

پاشان دەست بکە بە چارەسەرکردنی، وەك ئەمەی خوارەوە:

- لە هۆکارەکانی شەرمنی منداڵەکەت تێبگە، ئەگەر زانیت بە هۆی زیاد ئاگالێبوون، یان ڕەخنەگرتنی توند، یان پشتگوێخستنەوەیە" ئەوە پێویستە لەسەرت دەستبەرداریان ببیت، تا بتوانیت چارەسەری کێشەکە بکەیت.

- کاری زیاتر لە هێز و توانای خۆی مەخەرە سەرشانی، ئەمە وای لێ دەکات هەست بکات ناتوانێت ئەنجامیان بدات، لە دەرئەنجامدا شەرمی زۆرتر دەبێت، بەڵکو بەگوێرەی توانای خۆی بەرپرسیارێتیی بخەرە ئەستۆ.

- بیپارێزە لە ڕەخنەی توند و نازناوی ئازاربەخش لە چوارچێوەی خێزاندا، وەك وشەکانی (شەرمن، گۆشەگیر و...هتد)، چونکە بە زۆر گوێگرتنی بۆ ئەم جۆرە وشانە وای لێ دەکات بڕوایان پێ بکات و لەسەر بنەمای ئەوانە هەڵسوکەوت بکات.

- هانی بدە لەسەر پێشەنگایەتی و وتاردان لەناو خێزاندا، وای لێ بکە هەندێ سروود لەبەر بکات، کە واتای جوانیان هەیە و لە کۆبوونەوەی خێزانیدا پێشکەشیان بکات. لەسەر هەندێ پرسی گرنگ کۆبوونەوەی دوو قۆڵیی تایبەتی لەگەڵ ساز بکە، بواری بدە گوزارشت لە ڕاوبۆچوونی خۆی بکات.

- کچەکەت هان بدە هەرچییەکی دەوێت بەئازایی و بەبێ ترس و شەرم داوای بکات، هەروەها لە چەند چالاکییەکی پەروەردەیی

ئاماتجداردا بەشداریی پێ بکە، کە کیژۆڵەی بەڕەوشت و خاوەن سیفەتی جوانیش تێیدا بەشدارن، بۆ نموونە: خولی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، یان بنکە پەروەردەییەکان. لەمیانەی ئەم کارانەدا، بە پشتیوانیی خوای گەورە هاوڕێی باش دەناسێت، کە خێر لە سیمایان بەدی بکات.

– بۆ سەردانیکردنی کەسوکار و خزمان لەگەڵ خۆتدا بیبە، ڕایبهێنە، کە تێکەڵی کەسانی باش و چاك ببێت، بە جۆرێکی ئەوتۆ ڕابێت بە تێکەڵبوون و بتوانێت هاوڕێی نوێ بە دەست بهێنێت.

– لەبارەی هاوڕێیەتیی کەسانی باش و سیفەتی کچانی باشەوە زانیاریی پێ بدە، بە هەمان شێوە لە هاوڕێیەتیی کەسانی خراپ و سیفەتی کچانی خراپیش، ئەمەیش بۆ ئەوەی بتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان ئەم دوو جۆرەدا.

– با پێشوازی لە هاوڕێ تازەکانی بکات و سنووری مامەڵەکردن لە نێوانیاندا فراوان بکات، وا بکە هاوڕێکانی لەگەڵ بنەماڵەکانیان بانگهێشتیماڵەوەتان بکەیت، ئەم کارە هەستی ئارامی و جوانمامەڵەکردنی پێ دەبەخشێت.

خوای گەورە چاوت بە ساڵحبوونی کچەکەت ئاسوودە بکات و لە جوان پەروەردەکردنیدا یارمەتیت بدات.

❊ ❊ ❊

## • بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن لە لای کوڕە هەرزەکارەکەم

**پرسیار:**

**≡ بۆ بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن، چۆن مامەڵە لەگەڵ کوڕەکەم بکەم، کە تەمەنی لە دوانزە ساڵ زیاترە؟**

**وەڵام:**

منداڵەکەت چووەتە قۆناغی هەرزەکارییەوە، لێرەدا ئاراستەکردن و بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن بەگوێرەی تایبەتمەندیی ئەو قۆناغەی پێیدا تێپەڕ دەبێت، گۆڕانی بەسەردا دێت:

❖ سەرەتا، ئەم قۆناغە قۆناغی هاوڕێیەتیی نێوان تۆ و کوڕەکەتە، ناکرێت وەك منداڵ مامەڵەی لەگەڵ بکەیت، بەڵکو دەبێت وەك کەسێکی پێگەیشتوو مامەڵەی لەگەڵ بکەیت" هەروەها ڕاوبۆچوونەکانی وەك ڕاوبۆچوونی کەسێکی گەورە وەربگریت، بۆ ئەوەی کردار و گوتارت یەك بێت، پێویستیشە ببیتە نموونەیەکی پێشەنگ بۆ کوڕەکەت.

❖ ئاگالێبوونی خوای گەورەی بیر بخەرەوە، کە هیچ شتێکی لێ ون نابێت، با ئەم کارەیش لەمیانەی گفتوگۆی هەندێ لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئاندا بێت، لەوانە: ئامۆژگاریی لوقمان بۆ کوڕەکەی، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن

فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ (لقمان: ١٦)

واتە: "ئەی کوڕی ئازیزم! بەڕاستی، ئەگەر گوناهێك بەهێندەی تۆوی خەرتەلەیەك هەبێت و لەناو بەردێکدا لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا حەشاردرابێت، ئەوە خوا دەیهێنێتە مەیدان، چونکە بەڕاستی خوا هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە و لەڕادەبەدەریش ئاگایە".

یان ئەو فەرمایشتەی خوای مەزن، کە دەفەرموێت: ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾ (الأنعام: ٥٩)

واتە: "کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنییەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایانزانێت، جگە لەو زاتە. هەرچی لەسەر وشکانییە خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەن ئاگای لێیانە و هیچ گەڵایەك ناکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت" هەروەها دەنکێك، یان تۆوێك لە تاریکاییەکانی زەویدا نییە، ئەو دەنك و تۆوە چ شێدار بێت، یان وشك، هیچ شتێك نییە لە خوا پەنهان بێت" بەڵکو لە (لوح المحفوظ)دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتدا تۆمار کراوە".

❖ دەکرێت لە ڕێی چیرۆکگێڕانەوەوە هەندێ زانیاریی بدەیتێ

لەبارەی بەهای خۆچاودێریکردنەوە، وەك چیرۆکی ئـەو سـێ کەسـەی پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك. چیرۆکەکە لە (بوخاری) و (موسلیم)دا هاتووە، (عبدالله)ی کوڕی (عمر)ی کوڕی (خطاب) ﷺ دەفـەرموێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی:

(ڕۆژێکیان سێ کەس لە ئوممەتانی پێش ئێوە لەماڵەوە دەرچوون، بـۆ پشـوودان چـوونە نـاو ئەشـکەوتێك، لـەناکاو تاشـەبەردێك لـە شاخەکەوە کەوتە خوارەوە و دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، وتیان: هیچ شتێك لەم بەردە ڕزگارمان ناکات، تەنیا دۆعـا و پاڕانـەوە لـە خوای گەورە نەبێت بە کردەوە چاکەکانمان.

یەکێك لەوان وتی: دایك و باوکێکی پیرم هەبوو، هـەرگیز پـێش ئەوان، کە شیرم دەدۆشـی نەمدەدایـە مـاڵ و منداڵەکـەم. ڕۆژێکیـان لەبەر کاری لەوەڕاندنی ئاژەڵـەکانم لێیـان دوورکەوتمـەوە، تـا کـاتی خـەوتن نەگەڕامـەوە، شـیرەکەم بـۆ دۆشـین، بینـیم خـەوتبوون" لـە چاوەڕوانیی هەڵسانیاندا بەبێ ئەوەی خەبـەریان بکەمـەوە لـە لایـان مامەوە و جامی شیرەکەیش بەدەستمەوە بـوو، تـا بـەیانی داهـات، ئینجا هەڵسان و شیرەکەیان خواردەوە.. دەسـا پـەروەردگارا! ئەگـەر ئەو کارەم لەپێناوی تۆدا کردووە، دەرگامان لێ بکەرەوە و ڕزگارمان بکە.

تاشەبەردەکە کەمێك ترازا، بەڵام نەیانتوانی دەربچن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

کەسی دووەمیش وتی: خوایە! من کچە ئامۆزایەکم هەبوو، لە هەموو کەس لام خۆشەویستتر بوو، ویستم بۆ لای خۆمی ڕابکێشم و لەخشتەی بەرم، ڕێگریی لێ کردم، تا جارێك تووشی هەژاری و برسێتی بوو، ڕۆژێکیان هاتە لام، سەد و بیست دینارم پێدا بە مەرجێك خۆیم تەسلیم بکات، ئەویش خۆی تەسلیم کرد، تا توانیم لێی نزیك ببمەوە، پێی وتم: لە خوا بترسە! پاکیزەیی منت بۆ حەڵاڵ نییە، تەنیا بە مافی خۆی نەبێت (واتە بە مارەکردن)، شەرمم کرد زینای لەگەڵ بکەم، وازم لێ هێنا، لە کاتێکدا ئەو لە هەموو کەس لام خۆشەویستتر بوو، ئەو پارەیەیشیم لێ وەرنەگرتەوە، کە پێمدابوو...

دەسا پەروەردگارا! ئەگەر ئەو کارەم لەپێناوی تۆدا کردووە، دەرگامان لێ بکەرەوە و لەو حاڵە ڕزگارمان بکە، کە تێیداین.

بەردەکە هەندێکی تر جووڵا و ترازا، بەڵام هەر نەیانتوانی بچنە دەرەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

کەسی سێیەمیش وتی: چەند کرێکارێکم بەکرێ گرت، کرێی تەواوم بە هەموویان دا، جگە لە یەکێکیان، مافی خۆی جێهێشت و ڕۆیشت، پارەکەیم خستە کارەوە، تا زیاد بوو. دوای ماوەیەك کابرا هاتەوە بۆ لام، وتی: ئەی بەندەی خوا! کرێکەم بدەرەوە. پێیم وت: هەرچی دەبینیت لە وشتر و مانگا و مەڕ و کۆیلە هەر هەمووی هی

تۆیـە. وتـی: ئـەی بەنـدە خـوا! گاڵتـەم پـێ مەکـە. منـیش وتم: بەدڵنیاییەوە گاڵتەت پێ ناکەم و هی خۆتن، ئەویش هەموو شتێکی برد و هیچی جێنەهێشت.

دەسا پەروەردگارا! ئەگەر ئـەم کـارەم لـەپێناوی تـۆدا کـردووە، دەرگامان لێ بکەرەوە لەو حاڵەی، کە تێیداین.

ئـیتر تاشـەبەردەکە بەتـەواوی تـرازا و لاچـوو، ئـەوانیش هاتنـە دەرەوە)[1].

هەریەکێك لەو سێ کەسە کردەوەیەکی چاکیان ئەنجامدابوو، کـە چـاودێریکردنی خـوای پـەروەردگاری تێـدا دەرکـەوتبوو، لـە کـاتی بـەتوانایی و شـێنەییدا سـنووری خـوای گـەورەیان پاراسـتووە، پەروەردگاریش لە کاتی تەنگانە بـە هانایانـەوە هـاتووە و ڕزگـاری کردوون.

### یاخود چیرۆکی فرۆشیاری شیرەکە:

(عـبداللە)ی کوڕی (زید)ی کوڕی (أسلم) لە باوکییەوە، ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

"لە کاتیـکدا ئێمە لەگەڵ (عـمر)ی کوڕی (خطـاب) ﷺ بووین، کە شەوانە بە کوچە و کۆڵانـەکانی مەدینـەدا دەگـەڕا، لـە ناوەڕاسـتی شەودا ماندوو بوو پاڵی دا بە دیواری یەکێك لە ماڵەکانـەوە، گـوێی

---

[1] سەحیح بوخاری (٢١٢١).

لێ بوو دایکێك بە کچەکەی دەڵێت: بڕۆ لای شیرەکە و هەندێ ئـاوی تێکەڵ بکە.

کچکە وتی: دایە گیان! ئایا ئاگاداری بڕیارە توندەکـەی ئـەمڕۆی پێشەوا عومەر نەبوویت؟

دایکەکە وتی: کام بڕیارە توندە؟

کچەکە وتی: کەسێك بانگەوازی کرد، کە نابێت کەس ئاو تێکەڵ بە شیر بکات.

ئینجا دایکەکە وتی: دە هەستە کچەکەم بڕۆ ئاوی تێکـەڵ بکـە، تۆ لە شوێنێکی نە عومەر و نە بانگەوازەکەی عومەریش ناتبینن!

کچەکە وتی: سوێند بە خوا، من ئەو کەسە نیم، کە لە ئاشـکرادا ملکەچی بم و لە تەنیاییشدا سەرپێچیی بکەم.

کاتێـك عومـەر گوێبیسـتی ئەمـە بـوو، وتـی: ئـەی ئەسـلەم دەرگاکە نیشانە بکە، تا بیناسیتەوە، پاشان لـە گـەڕان و سـووڕانی بەردەوام بوو.. کاتێك بەیانی داهات، فەرمووی: ئەی ئەسلەم! بڕۆ بۆ شوێنەکە، بزانە کێ بوو ئەم قسانەی کرد، ئایا هاوسەری هەیە؟

منیش چوومە شوێنەکە و زانیم کچەکە شووی نەکردووە، تـەنیا خۆی و دایکی بوون، هیچ پیاویان نییە. گەڕامە لای (عمر)ی کـوڕی (خطاب) و پێم ڕاگەیاند، ئینجا عومەر کوڕەکانی خۆی کۆکردنەوە و پێی وتن: کەستان حـەزی لێیـە ژن بهێنێـت و بـۆی بهێـنم؟ ئەگـەر

باوکتان ویستی بۆ ژنان هەبوایە، کەستان بـۆ ئـەو کیژۆڵەیـە پێشـی نەدەکەوت.

عەبدوڵڵا وتی: من خێزانم هەیە. عەبدولڕەحمانیش وتی: منـیش خێزانم هەیە. پاشان عاصم وتی: من خێزانم نییە، بـۆ مـنی بهێنـە. ئەویش ناردی بە دوای کیژۆڵەکـەدا و لـە عاصـمی مـارەکرد. ئـەو ئافرەتە لە عاصم کچێکی بـوو، ئـەو کچـەیش کچـێکی بـوو، لـەم کچەیشیانەوە (عمر)ی کوڕی (عبدالعزیز) (ڕەحمەتی خوای لێ بێـت) لەدایك بوو".

بەم شێوەیە دەکرێـت چـیرۆکی مێـژوویی بـۆ بخوێنرێتـەوە، کـە دابونەریتی گـەل و نەتـەوەکانی پێشـووی تێدایـە، کـە چـۆن خـوای پەروەردگار حەقی بەسەر ناحەقدا سەرخستووە، مانەوەیش تەنیا بـۆ خوای تاك و تەنیا و بۆ ئەوانەیە، کە دەست بە دینەکەیانەوە دەگرن و سەرخی دەخەن.

❖ پاداشت و خەڵاتی خوایی بۆ دەربخە، کە بۆ کەسێکە ڕەچاوی مافەکانی خوای پەروەردگار دەکات و خوا دەپەرستێت و لە پەنهان و ئاشکرادا ئاگاداری چاودێریی ئەو زاتەیە: وەك دەڵـێن (ابـن عبـاس) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ڕۆژێکیان لـە پشـتکەی پێغەمبـەری خواوە ﷺ سواری ولاخێك بووم، پێی فەرمووم: **(ئەی لاوا من چـەند وشەیەکت فێر دەکەم، ئاین و سنوورەکانی خوای گـەورە بپـارێزە، ئەویش دەتپارێزێت. ئاین و سنوورەکانی خوای گەورە بپارێزە، لە**

**کاتی پێویستیدا خوای گەورە لـە بەرامبەرتـدا دەبینیـت. ئەگـەر پاڕایتەوە لە خوا بپاڕێرەوە، ئەگەر داوای پشتیوانیت کرد لە خوا داوا بکە. بیشزانە، ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، هیچ سوودت پێناگەیەنن مەگەر خوای گـەورە بـۆی نووسیبیت، خۆ ئەگەر هەموو خەڵکیش کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن، هیچ زیانت پێناگەیەنن مەگـەر خـوای گـەورە بـۆی نووسیبیت. قەڵەمەکان بەرزکرانەوە و پەڕاوەکانیش وشك بوونەوە).**

❖ گفتوگۆی لەگەڵ بکە لەبارەی چارەنووسی کەسـێکەوە، کـە گوێ بە چاودێریی خوای پەروەردگار نادات و بـە چـاوێکی کەمـەوە سەیری دەکات:

(ثوبـان) ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتـەوە، کـە دەفـەرموێت: **(خەڵکانێك دەناسم لە ئوممەتەکەم، ڕۆژی دوایی بە چاکەیەکەوە دێن بە ئەندازەی شاخی (توهامە) سپی، بەڵام خوای گەورە هەموویانیان لێ پەرشوبڵاو دەکاتەوە).**

ثـوبـان وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بۆمـان وەسـف بکـە و سیفەتەکانیانمان بۆ ئاشکرا بکە، نەوەك ئێمە لەوان بین و هەستیشـی پێ نەکەین!

فەرمووی: **(ئەوان براتانن، لە پشتی ئێوەن، وەك ئێوە بەشـێکی شەویان بە بەندایەتی دەبەنەسەر، بەڵام ئوممەتێکن گەر بچـنە نـاو**

قەدەغەکراوەکانی خواوە سنوور دەبەزێنن).[1]

❖ خاڵە شاراوە باشەکانی بورووژێنە، نرخ و بەهای خۆی لای پەروەردگار پێ بناسێنە، کە ئەو زۆر گەورەترە لەوەی کارێك بکات خوای پەروەردگار ڕازی نەبێت لێی.

یەکێك لە دایکەکان دەڵێت: "هەمیشە باسی کەسایەتییە باش و جیاوازەکەی کوڕەکەم بۆ خۆی دەکەم، کە لە پلەوپایەی بەرز دەکاتەوە، بەردەوام پێی دەڵێم: تۆ کەسێکی ژیر و باشیت.. سوپاس بۆ خوا شوێنەواری ئەم قسانەم لە هەڵسوکەوتەکانیدا بینیوەتەوە، بەتایبەت کاتێك بۆ خۆی پێداچوونەوە بە هەڵەکانیدا دەکات.

❖ لەو شتە قورسانەی دەبنە کۆسپ لەبەردەم هەستکردنی بە بوونی چاودێریی خوا، گفتوگۆی لەگەڵ بکە و چارەسەری زانستیی بۆ دابنێ.

❖ هۆیەکانی بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن بگۆڕە و هەرجارەو بە شێوازێك، بەتەنیا پشت بە یەك شێواز مەبەستە، هەمیشە سەرنجی ئاستی گەشەسەندنی ئەو بەهایەی لە لا بدە. خۆ ئەگەر زانییشت خەسڵەتێکی جوان و باشی تێدایە، بەهێزی بکە لە لای، لە بەرامبەریشدا ئەگەر زانیت خەسڵەتێکی تێدایە باش نییە، بە شێنەیی و قۆناغبەندی گفتوگۆی لەگەڵدا بکە، بە نەرمونیانی سەرنجی بۆ ئەو سەرپێچییە ڕابکێشە، کە ئەنجامیداوە. خۆت دوور

---

[1] تیرمزی گێڕاویەتیەوە و دەڵێت فەرموودەیەکی (حسن صحیح)ـە.

بخەرەوە لە پیاهەڵشاخان و هەڕەشەلێکردن، یان خۆبێئاگاکردن، یـان ئەوەی فشاری بخەیتە سەر و توندبیت لەگەڵیدا، چونکە لەوانەیە ئـەم جۆرە هەڵسوکەوتانە وای لێ بکەن بەئاشکرا کاری باشە بکات و لـە پەنهانییشدا کاری خراپ.

❖ توانای خۆت سەرف بکە و داوای پشتیوانییش لە خوا بکە، پەلە مەکە لە بەدەستهێنانی بەروبوومەکەی (وەك ئەو کەسەی بەر لە پێگەیشتن میوە بخـوات). خـوای گـەورە بـۆ هـەموو کـارێکی خێـر سەرکەوتووت بکات و چاوەکانت بە ساڵحبوونی کوڕەکەت ئاسـوودە بکات.

❊❊❊

- **کوڕەکەم و یارییە ئەلیکترۆنییەکان**

**پرسیار:**

**≡ چۆن بڕوا بە کوڕەکەم (تەمەنی ١٢ ساڵانە) بهێنم، کە نابێت ئەم یارییە بکات، یان خراپە بۆی، لەگەڵ ئەوەی هەموو هاوڕێکانی دەیکەن و خۆیشی زۆر پەیوەست بـووە پێوەیـەوە، ئەگەرچـی مـن ئامێرەکەی نادەمێ، تەنیا لە پشووی هەفتەدا نەبێت ئەویش بۆ چەند سەعاتێکی دیاریکراو؟ داوم لێ دەکات بە شێوەی (ئۆنلاین) یاری لەگەڵ هاوڕێکانی بکات، بێزاری دەردەبڕێت لە ئاستم، چونکە زۆر لەسەری توند دەکەم و وەك هاوڕێکانی ئازادیی تەواوی پێ نادەم،**

**هەروەها لە سەیرکردنی (یوتیوب)دا کاتێکی زۆر بەفیڕۆ دەدات بۆ ئەوەی بزانێت ئەم یارییە چۆن دەکرێت؟**

**وەڵام:**

لە پرسیارەکەتدا ئەندازەی خەمخواردن و شپرەزەییت هەست پێ دەکەم، هەروەها هەست بەو ململانێیە دەکەم، کە هەموو جارێك لە کاتی پێدانی ئامێرەکە بە کوڕەکەت دووبارە دەبێتەوە.

کوڕەکەت لەم تەمەنەدا پێویستی بە چەند خاڵێکە، تا لەگەڵیدا ڕێککەوتنێك واژۆ بکەیت بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە:

**یەکەم:** دەکرێت لە کەشێکی ئارامدا وتووێژی لەگەڵ بکەیت، کە ئایا بە بۆچوونی ئەو، لایەنە باش و خراپەکانی ئەم یارییە چین؟ قسەکانی بە بێبایەخ وەرمەگرە و گاڵتەی پێ مەکە، قەشمەری بە ڕاوبۆچوونەکانی مەکە تەنانەت، ئەگەر بە دڵیشت نەبن.

**دووەم:** دوای وتووێژەکە هەوڵ بدە لەگەڵی بگەیتە ڕێککەوتنێك لەبارەی جۆری ئەو یارییەی بڕیارە بیکات، با دادوەری ئەم بابەتەیش سەنتەری ڕێکخستن و پێشخستنی یارییە ئەلیکترۆنییەکان بێت لە تۆڕی ئینتەرنێت، بەم ناونیشانە: http://egrdc.org.

ئەم سەنتەرە بەکارهێنانی یارییەکان دیاری دەکات، تا چەند سوود، یان زیانیان هەیە. ئەم ڕێگەیە (یاخود ئەم ماڵپەڕە: سەنتەری ڕێکخستنی یارییەکان) سوودی دەبێت، چونکە منداڵ لەم قۆناغە زیاتر مەیلی بە لای لاساییکردنەوەی هاوڕێکانیدا دەچێت وەك لەوەی گوێ لە ئامۆژگارییەکانی دایك و باوکی بگرێت.

کە زانیشی ئەم ڕووخسەتپێدان و ئامۆژگارییانە، تەنیا تایبەت نین ب ئەوەوە، بەڵکو بۆ تەواوی ئەوانەیە، کە لە هەمان تەمەندان، ئەوە وا دەکات قەبووڵی بکات و تەسلیمی بێت. زۆرێك لە منداڵەکان بەهۆی ملکەچبوونیان بۆ دایکان و باوکانیان ڕووبەڕووی گاڵتەپێکردن و ڕەخنەی هاوڕێکانیان دەبنەوە، بەڵام کاتێك زانییان سەرچاوەی ئامۆژگارییەکە شوێنێکی دیکەیە و بۆ هەموانە، ئیتر ئەوە بە پشتیوانیی خوا وا دەکات قەبووڵی بکات.

ئەم ماڵپەڕەی سەرەوە پوختەیەکی لەبارەی ناوەڕۆکی یارییەکانەوە تێدایە، کە منداڵەکان ئەنجامی دەدەن، لەبارەی هەر یارییەکیشەوە پێناسەیەکی کورتی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تێدایە، هەروەك ئاستی تەمەنی گونجاو بۆ هەر یارییەك دیاری دەکات. ناوی یارییەکە لە نیشاندەری گەڕان بنووسە، یان داوای ڕێکخستنی لێ بکە. خۆزگە کوڕەکەیشت لەم گەڕانەدا بەشداریی لەگەڵ دەکردیت.

جا ئەگەر دەرکەوت یارییەکە گونجاوە، ئەوکات ئاساییە لەگەڵ هاوڕێکانی لە کاتێکی دیاریکراودا بیکات، بەڵام ئەگەر گونجاو نەبوو پێویستە جێگرەوەی تری لەناو یارییەکاندا بۆ بدۆزەیتەوە، کە لە ڕووی ڕەوشتەوە گونجاو بێت و ڕەچاوی قۆناغی تەمەنەکەیشی بکات.

بەڵام سەبارەت بە قسەکەت لەبارەی بەفیڕۆدانی کاتەوە، کارێکی باشت کردووە، بەڵام گرنگە بە گفتوگۆکردن لەگەڵیدا لەبارەی ئەم بابەتەوە شێوازی نەرمونیان و دوور لە تووڕە و توندوتیژی

بـەکاربهێنیت. دەکرێـت پێکـەوە بچـن بـۆ باخچـەیەکی نزیـك و دەمەتەقێیـەکی گاڵتـەئامێزی لەگەڵـدا بکـەیت و بابەتەکـەی بەگرنگییەوە لەگەڵ بکەیتەوە، لەتەك تێبینییەك، کە لە بیر نەکەیت و بریتییە لەوەی، کە: تـۆ بـەپێی توانـا پێشـەنگی بیـت، ئاسـاییە گوێبیستی بەرهەڵستییەکەی، یان ڕەخنەکەی بیت، بەڵام بە مەرجێك بە شێوەیەکی ئارام و دروست گوزارشتیان لێوە بکات. یـان دەکرێـت لە ساتێکی تـری ئارامیـدا - بـۆ نموونـە کـاتی نـانخواردن - باسـی ئەوکاتانە بکەیت کوڕەکەت بەجوانی بەسەری بردووە، ستاییشی بکە و سەرسامیی خۆت بـۆ هەڵسـوکەوتەکەی دەربـبڕە. لـە کـاتی تـردا دەکرێت هەنـدێ چیرۆکی بـۆ بـاس بکـەیت، کـە گرنگیـی (کـات) دەردەخەن و چۆن توانیویانە سوودی لێ وەربگرن. بە ئامۆژگاریکردن پەیمانی پێ بدە، شـێوازەکانی باسـکردنەکانت بگـۆڕە، زۆر لـە خـوا بپاڕێرەوە، کە بۆتی ساڵح بکـات و لـە پەروەردەکردنیـدا یارمـەتیت بدات.

***

## ● کوڕەکانم و ئازادییان

**پرسیار:**

**≡ حەزم لە کاری خێرە بۆ منداڵەکانم" ئامۆژگارییان دەکەم، چاودێرییـان دەکەم، گرنگی بە کاروباریان دەدەم، بـەڵام گرفتەکـەم لێرەدا ئەوەیە، کە بەبێبایەخەیەوە لەم کـارەم دەڕوانـن و ڕێـز بـۆ**

**ماندووبوونم دەرنابڕن! وا دەزانن ئەم جۆرە کارانە دەستوەردانە لە تایبەتمەندییان، گوایە دەبێت ئەوان ئازادیی کەسایەتییان هەبێت.. کەواتە چارەسەری گونجاو بۆ ئەم جۆرە مامەڵەیە چییە؟**

**وەڵام:**

خۆزگە نموونەیەکت باس بکردایە، تا زیاتر لام ڕوون بوایە، چونکە ئازادیی تاکەکەسی لە لای باوان و منداڵەکان جیاوازیی هەیە!

هەندێ لە باوان دەستوەردان لە هەموو کارێکی منداڵەکانیاندا دەکەن، ڕێگەیان پێ نادەن تەنانەت کاروباری تایبەتیی خۆیشیان ڕاپەڕێنن، بوار لە بەردەم پێویستیان بە سەربەخۆیی و پشتبەستن بە خۆیان و هەستکردن بەتواناکانیان تەسك دەکەنەوە. بۆیە ئەم جۆرە باوکانە بە تێگەیشتنی خۆیان بۆ ئازادی، مافی ئازادی نادەنە کوڕ و کچەکانیان، لە بەرامبەردا پێویستە کوڕان و کچان بزانن هیچ ئازادییەکی ڕەها لە ماڵدا بوونی نییە، ئەگەر وا بێت ئەوە ماڵ دەبێتە دارستان و گەڕەلاوژە دروست دەبێت و دەبێتە هۆی لەدەستچوونی مافەکان و ونبوونی بەرپرسیارییەتییەکان و تێکەڵبوونی ئامانج و هۆیەکان..

چارەسەر میانەگیرییە، نەك زیادەڕۆیی و کەمتەرخەمی. بۆیە پێویستە سەرنج بدرێتە ئەمانەی خوارەوە:

* پێویست ناکات خۆشەویستی - کە بزوێنەری سەرەکیی

پەیوەندیی نێوان باوك و منداڵەکانە - بگۆڕدرێت بۆ ترسی زۆر، یان بۆ جۆرێك لە کۆنترۆڵکردن، ئەمە بۆ منداڵەکان ئازاربەخشە، تووشی کەساسییان دەکات" دەیانکات بە کەسایەتییەکی شڵەژاو، کە توانای بڕیاردانیان نەبێت.

* دەبێت هەموو منداڵەکان بزانن، کە ئازادیی هەر ئەندامێکی خێزان بە کۆمەڵێك سنوور و ڕێکخەر دەورەدراوە، پێویستە لە بەرامبەر سەرپێچیکردنی ئەم یاسایانە سزا دابنرێت، وەك:

- فلانەکەس مافی هەیە ئامێری زیرەك لە ڕۆژانی پشوودا بۆ ماوەی دوو کاتژمێر بەکاربهێنێت، هەروەها لە ڕۆژانی دەوام یەك کاتژمێر. لە دوای کاتژمێر حەوت بەکارهێنانی قەدەغەیە، سەبارەت بە کاتژمێرەکانی تر خۆی ئازادە چ کاتێك بەکاری بهێنێت و چ کاتێکیش وازی لێ بهێنێت.

- لە کاتی بانگ، یان چوون بۆ مزگەوت، بەخێرایی سەرجەم ئامێرەکان دادەخرێن.

- چوونە قوتابخانە هەرگیز جێی قسەلەسەرکردن نییە، بەڵام دەکرێت بۆ حەزی خواردنی ئێواران، یان بەیانیان مافی هەڵبژاردنی هەبێت.

(لە بەشی یەکەمدا، چۆنێتیی دانانی یاساکان بە بەشداریی منداڵەکان شیکراوەتەوە).

* لەو بوارانەی یاسای ناوماڵ نایگرێتەوە، منداڵان ئازادییان پێ

بدرێت، هەموو ئەندامێك مافی هەیە كاروبـاری تایبـەتی خـۆی لـە كـاتی گونجـاودا ڕابپـەڕێنێت، جۆرێـك لـە ئازادییشـیان لـە جێبەجێكردنیدا پێ بدرێت" هەروەها هەلی بڕیاردانیـان لـە هەنـدێ كاردا پێ بـدرێت، وەك ئـەوەی بتـوانین لـە ڕۆژی هەینیـدا شـوێنی دەرچوون بۆ پشوودان دیاری بكـەن، یـان دیـاریی جـەژن بـۆ خۆیـان دەستنیشان بكەن، بەرپرسیارێتیی سەرئەنجامی هەموو بڕیارەكـانیش لە ئەستۆ دەگرن، چـونكە ئـەم كـارە هەسـتی بەرپرسـیارێتیان پـێ دەبەخشێت.

* لەبری ئەوان ئیش و كار نەكرێت، قسـەیش بـەناوی ئەوانـەوە نەكرێت، بەڵكو بواریان بدرێت خۆیـان گوزارشـت لـە ڕاوبۆچـوونیان بكـەن. گوێیـان بـۆ بگـرە و ڕاوبۆچـوونەكانیان وەربگـرە، هـەموو ئەندامێك مافی هەیە بیروبۆچۆنەكانی بخاتەڕوو و لەبارەیەوە گفتـۆی لەگەڵت بكات، جا ئەم ڕاوبۆچوونانە هەرچۆنێك بن.

* وەك هاوڕێ مامـەڵەیان لەگەڵ بكرێت، دەرگای گفتوگۆیان بـە ئارامی و دڵنەرمی بۆ بكرێتەوە، تـا بتـوانن دڵـەكانیان بكەنـەوە و تۆیش لە ئازار و مەینەتی و ئاواتەكانیان بەشداری پـێ بكـەن. ئـەم جـۆرە كـارەیش هـەلت پـێ دەدات، تـا بتوانیـت هەڵـە و تێگەیشتنەكانیان بۆ ڕاست بكەیتەوە.

* هەرگیز نەكەیت ئاستی خۆت لـە بەرامبـەر كوڕەكانتـدا كـەم بكەیتەوە، تا متمانەیان بە خۆت و حیكمەتەكانت بـەردەوام بێـت و تۆیش بتوانیت لە قەدەغەكراوەكان بیانوەستێنیت.

* ڕەق و توند مەبە لەگەڵیان، نەوەك بگەنە قۆناغی (گوێپێنەدان)، کە گرنگیت پێ نەدەن و لە سزا نەترسن، یاخود لە ئامادەبوونی تۆ گوێگر و ڕێکوپێك بن و لە نائامادەیی تۆیشدا سەرپێچی بکەن، چونکە ئەمە زۆر مەترسیدارە. بەڵکو دڵنەرم بە لەگەڵیان، ڕێز لە هەست و سۆز و حاڵیان بگرە، ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت لە ڕێکخستن و جێبەجێکردنی یاساکان بیانبووریت، بەڵکو هەڵبژاردنی باشترین جۆری شێوازە، تا بگەیتە ئەو ئامانجەی داواکراوە.

خوای گەورە سەرکەوتووت بکات و بە منداڵەکانت سوودت پێ بگەیەنێت.

* * *

- **کچەکەم لێم وەرناگرێت:**

**پرسیار:**

**≡ کچەکەم تەمەنی یانزە ساڵە، هیچ شتێکم لێ وەرناگرێت، وێڕای ئەوەی لەناو خێزانێکی موحافیزکار دەژی، زۆرجار ستایشی دەکەم و بەناوی عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە - ڕەزای خوای لێ بێت - نازناوی (عائیشە)ی پێ دەدەم، بەڵام هیچ سوودی نییە" من**

**وای دەبینم لاسایی هاوڕێکانی دەکاتەوە، لە بەرامبەریاندا شانازی دەکات بەوەی، کە حەزی لە یاریی (جومناستیك)ـە، ئەمە زۆر نیگەرانم دەکات" چۆن وای لێ بکەم قسەم لێ وەربگرێت، تا بتوانم بەهاکانی لە لا گەورە بکەم، بەتایبەت خۆچاودێریکردنی؟**

**وەڵام:**

ڕات چییە بۆ ئەوەی بتوانیت کاریگەریت لەسەری هەبێت سەرەتا پەیوەندییەکی ئەرێنی لەگەڵ کچەکەتدا دروست بکەیت؟ یاسایەکی زێڕین لە پەروەردەدا هەیە، کە دەڵێت: (تا بۆشایی نێوان منداڵ و پەروەردەکار بچووکتر بێت، توانای چاودێریکردن و کاریگەری لەسەر منداڵ زیاتر دەبێت، پێچەوانەکەیشی ڕاستە).

لێرەدا بۆ ئەوەی بتوانیت لە حەز و خولیاکانی بگەیت و کاریگەریت لەسەری هەبێت و بەهاکانی لە لا پیرۆز بکەیت، پێویستە لەسەرت پردی پەیوەندیی نێوان خۆت و کچەکەت دروست بکەیت، پەیوەندییەکی ئەرێنی لەسەر بنەمای خۆشەویستی و بایەخپێدان بنیاد بنێیت، ئەم کارەیش بەم هەنگاوانەی خوارەوە دەبێت:

❖ تەرخانکردنی ٢٠ خولەك کاتی ڕۆژانە وەك گفتوگۆی هاوڕێیەك لەگەڵ هاوڕێ کچەکەی (بەڵام بەبێ ئامۆژگاریکردن و وانەپێدان)، بە جۆرێك لە کارێکدا بێت هەردووکتان کۆبکاتەوە بەبێ کەسی سێیەم (وەك ئەنجامدانی وەرزشێکی سووك لە ماڵەوە، یان

پیاسه له حەوشەی ماڵ و... هتد). یان دەکرێت لەمیانەی نانخواردن، یان چوون بۆ بازاڕکردن، یاخود هەر کارێکی تر... ئەمە وای لێ دەکات هەست به نزیکی و خۆشەویستیت بکات بۆ خۆی.

❖ کچەکەت پێویستی به بەرکەوتنێکی سۆزداریی تۆ هەیە، دوودڵ مەبه له دەستهێنان به سەریدا کاتێك بەیانیان له خەو هەڵدەستێت، بەرلەوەی له ماڵ بچێتە دەرەوە لە ئامێزی بگرە، به هەمان شێوە کاتێك دەیشگەڕێتەوە. ڕۆژانە پێنج جار ماچی بکە، ماچی پەرۆشبوون و شانازی پێوەکردن. له کاتی پرسیارکردن دەستی بدە له پشتی و لێی بپرسە: کچەکەم! چیت کرد له قوتابخانە؟

ڕابەرمان لەم ڕووەوە پێغەمبەرە ﷺ، کە سەردانی ئەنسارییەکانی دەکرد و سەلامی له منداڵەکانیان دەکرد و دەستی دەهێنا بەسەریاندا.[1]

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ (حسن)ی کوڕی (علي) ماچ کرد، لەو کاتەدا (أقرع)ی کوڕی (حابس التميمي) له لای دانیشتبوو، ئەقرەع وتی: من دە منداڵم هەیە، تا ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە. پێغەمبەری خوا ﷺ سەیرێکی کرد، پاشان فەرمووی: (**هەرکەسێك ڕەحم و بەزەیی نەنوێنێت، ڕەحم و بەزەییشی لەگەڵ نانوێنرێت**).[2]

---

[1] حديث موقوف، صحيح ابن حبان ٤٦٤.

[2] بوخاری (٤٦٤٦).

❖ رۆژانە ستاییشی پێنج ڕەفتـاری ئـەرێنیی کچـەکەت بکـە، گەرچی بە دیدی تۆ بچووکیش بن (تۆ زۆر باشیت، چونکە پارێزگاری لـە نوێـژەکان دەکـەیت). هـەروەها سـتاییش و پیاهەڵـەدان بـە ڕووخسارییەوە وەك: (چاوەکانی، زەردەخەنەکـەی و... هتـد)، پێـنج جار ئەمە بکە،[1] چونکە ستاییشکردن ورە بـەرز دەکاتـەوە و خاڵـە جوانەکانی لە لا دەچەسپێنێت، هۆیەکی پەروەردەییە، کە پێویستیی منداڵەکە تێر دەکات.

❖ بۆ ئەوەی متمانەی نێوانتان زیاد بێت، بـەجوانی گـوێی بـۆ بگـرە، بـەبێ فـەرزکردنی ڕاوبۆچـوونت لەسـەری، یـان پچـڕاندنی قسەکانی" ئەمەیش دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی گفتۆگـۆی زۆر لـە بابەتگەلی جۆراوجۆردا.

❖ بەشداریپێکردنی لە هەندێ چالاکی دا،کـە حـەزی لێیانـە، وەك وێنە و ڕەنگکردن و هەڵواسینی بەرهەمەکانی لەناو ماڵ.

❖ بەهرەکانی بدۆزەوە و کار بۆ گەشـەپێدانیان بکـە (هونـەری جوانکاری، دروستکردنی کێك، بەرگدوورین، هونەری وێنەگرتن و... هتد). دەکرێت بەشداریی پێ بکەیت لە هەندێ خولـدا لـەم ڕووەوە، ئەو پێویستی بە دەستکەوتە دەبێت هاوکاری بکـەیت. کارنـەکردنی منداڵ لە هـیچ بوارێـك لـەم بوارانـەدا جۆرێـك لـە هەسـتکردن بـە

[1] ڤیدیۆی بنیادنانی پەیوەندیی ئەرێنی لەگەڵ منداڵان، مصطفى ابو سـعيد ئـەبو سـەعد، (بەدەستکارییەوە).

کەموکوڕی و بێتوانایی لە لا دروست دەکات.

هەندێ لەو کێشانە - کە دێنە ڕێت - بخەرە بەردەمی کچەکەت و بۆچوونی لە بەرامبەریاندا وەربگرە، ڕێز لە قسەکانی بگرە گەرچی بێمانایش بن.

لەسەر ئەم شێوازە بەردەوامبە تاماوەیەك، تا دەبینیت خەریکە دڵی بۆت دەکاتەوە و سەبارەت بە خەمەکانی بەشداریت پێ دەکات، ئا لێرەدا هەوڵ بدە چ بەهایەکت دەوێت لە لای پیرۆز و بەهێزی بکە، بەڵام بە مەرجێك فشاری لەسەر دروست نەکەیت، ڕاسپاردەکان ئاوێتەی سۆز و خۆشەویستی بکە، شێوازەکانی ئامۆژگاریکردن بگۆڕە (بەگوێرەی بارودۆخی دەوروبەر و حاڵی کچەکەت). بەهاکان ناگۆڕدرێن و جێگۆڕکێیان پێ ناکرێت، بەڵام پەروەردەکار پێویستی بە دەستبەرداربوونە لەو شێوازە تەقلیدییەی، کە لە پەروەردەکردندا هەیەتی، یان ئەو شێوازە کۆنەی پێشووتر پشتی پێ دەبەست بۆ چاندنی بەهاکان. دەبێت لەبیرت نەچێت، کە سەردەم گۆڕاوە و هەر سەردەمێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە، بۆیە دەبێت شێوازە پەروەردەییەکان بەگوێرەی گۆڕانکارییەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت، جاری وا هەیە ئامۆژگاریکردن بە وشەی خێرا دەبێت (خاتوو... ما شاء الله هەر جارێك سەیرم دەکەیت، زەردەخەنەم بۆ دەکەیت! یان هەرجارێك داوای شتێکم لێ کردبێت بەخێرایی ئەنجامت داوە!). هەندێ جاریش بە شێوەی درێژدادڕی و شیکردنەوە دەبێت، جاری وایش هەیە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، هەندێ جاریش بە شێوەی هاندان

بۆ حەزکردن، یاخود بە شێوەی نواندن، یان چیرۆکگێڕانەوە... لێرەدا هەوڵ بدە ڕێگەی نماییشەکەت سەرنجڕاکێش بیت، چیرۆکگێڕانەوە کار لەسەر ورووژاندنی سۆزداری و هەڵچوونەکان دەکات، کچەکەت کەسایەتیی ناو چیرۆکە وەردەگرێت و لەگەڵی ئاوێتە دەبێت... لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، پێویستە خۆت بە ئارامگرتن و کۆڵنەدان و جوانمامەڵەکردن بڕازێنیتەوە، داوای پشتیوانی و یارمەتی و ڕاستەڕێکردن و ساڵحکردنی کچەکەت لە خوا بکەیت، چونکە ئەو پشتیوانی ئەم کارەیە و توانای هەیە لەسەری.



## • منداڵەکانم و لاوازیی متمانەبەخۆبوونیان

**پرسیار:**

**≡ دەبینم منداڵەکانم زۆر لە سزای خوا دەترسن، وێڕای ئەوەی هاوڕێ لەگەڵ سزادا باسی پاداشتیشیان بۆ دەکەم، وای بۆ دەچن هەر کارێکی ئەنجامی دەدەن هەڵەیە، متمانە بە خۆیان ناکەن" پێویستم بە ڕێگەیەکە بەبێ ترسێکی زۆر، تا بتوانم متمانە بەخۆبوونیان لا بەهێز بکەم. بۆ زانیاریت تەمەنیان لە نێوان ٦ بۆ ٨ ساڵانە، لەگەڵیاندا دەستم کرد بە ستاییشکردنیان و چەندان ڕێگەی تر، بەڵام دەترسم لە داهاتوودا شڵەژاو باربێن!**

**وەڵام:**

خوشکی بەڕێزم! سەرەتا پێویستە خۆت لە ترساندنی منداڵەکانت بە خوای پەروەردگار بەدوور بگریت، چونکە منداڵەکان دەروونێکی هەستیاریان هەیە لەوانەیە پێچەوانە لێی تێبگەن. وا بکە قسەکانت لەگەڵیان لایەنی خۆشەویستکردن و باسکردنی پاداشتیان زیاتر بێت.

لەوانەیشە لاوازیی متمانەبەخۆبوونی منداڵەکانت وای کردبێت پەشۆکاو و ترساوبن لە هەر ڕەفتارێك بیکەن و پێیانوابێت هەڵەیە. سووربە لەسەر ئەوەی ئەم هەستەیان لە لا سووك بکەیت و بیرەوێنیتەوە، بیروبۆچوون و کارتێکردنیان ڕاست بکەیتەوە بە

مـەرجێك كردەوەكانیـان دووربـن لـە هەڵـە (هەموویشـمان هەڵـە دەكەین).

لێـرەدا چـەند هـەنگاوێكی بـەهێزكردنی متمانەبـەخۆبوون بـاس دەكەین:

* منداڵەكەت وا تێبگەیەنە، كە تۆ متمانەی تەواوت بە هێز و تواناكانی هەیە - بەكردەوە ئەمە بسەلمێنە، نەك بە قسە - دەكرێـت ئەم كارەیش بە پێدانی بوار بۆ ئەنجامـدانی هەنـدێ كـار و چـالاكی گونجاو لەگەڵ تەمەنی پێ بـدرێت، تـۆیش هـانی بـدە و ورەی بـەرز بكەرەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش هەندێ كاروباری ناومالّی پێ بسپێریت وەك ڕێكخستنی ژووری نووستن، یان كاروباری چێشتخانە. ئاگاداربە كارێكی پێ نەسپێریت لە سەرووی توانـای خۆیـەوە بێـت و هەسـت بكات بێدەسەڵاتە بەرامبەری.

* ڕەخنە لە منداڵەكەت مەگرە، یان سیفەتێكی ناشرینی پێـوە مەلكێنە، لەبەر ئەوەی كارێكی هەڵەی كردووە، بـەڵكو ڕەخنـە لـە ڕەفتارەكەی بگرە، نەك لە خودی خۆی. لەجیاتی ئەوەی پێی بلێیـت (تۆ كوڕێكی بێ زەوقیت)، پێی بڵێ: (مامـەڵەكـەت لەگـەڵ براكـەت بێزەوقیـی پێـوە دیـاربوو و هەسـتت برینـدار كـرد)، یـان بلێیـی (بچووكەكەم! خۆشم دەوێیت، بـەڵام ئـەم ڕەفتـارەت لای مـن جـوان نییە)، یان (تۆ كوڕێكی ڕەوشتبەرزیت، چۆن درۆم لەگەڵ دەكەیت!)

* هەمیشە پێی ڕابگەیەنـە، كـە خۆشـت دەوێـت و مرۆڤێكـی

خۆشەویستە لە لات، هەر ڕەفتارێکی ئەرێنیی هەبوو تۆ گەورە نیشانی بدە ئەگەرچی لە دیدی تۆیشدا بچووك بێت. بۆ نموونە: ئەگەر یارییەکانی خۆی ڕێکخستبوون، پێی بڵێ، کە پاکوخاوێن و ڕێکوپێکی. ئەگەر یارییەکی دا بە براکەی، ستاییشی بکە بەوەی، کە کەسێکی بەخشندە و بەڕەوشتە.

* جێگرەوەی ئەرێنی پێشکەش بکە، لەبری ئەوەی پێی بڵێیت (لە براکەت دووربکەوەرەوە)، پێی بڵێ (وەرە لێرە یاری بکە).

* ئەگەر ویستت هاوکاریت بکات لە کارێکدا، ڕوونکردنەوەی تێروتەسەلی پێ بدە لەسەر ئەو شتەی، کە لە ئەوت دەتەوێت: (بەیارمەتیت یارییەکەت کۆبکەرەوە، لەناو سندووقی یارییەکان دایبنێ، دوور لە سەرەڕێگە).

* هەوڵ بدە سوپاسی منداڵەکەت بکەیت لەسەر هەرکارێك، کە یارمەتیت دەدا، تەنانەت، ئەگەر کارێکی سادەیش بێت.

* لەسەر بڕیاردان هانی بدە، پرسیاری ڕاوبۆچوونی لێ بکە، لە هەندێ کاردا بۆچوونی وەربگرە.

* چیرۆك سیحرێکی سەیری هەیە، کاریگەریی لەسەر شێوازی بیرکردنەوەی منداڵ و هەڵسوکەوتەکانی دەبێت، هەوڵ بدە ڕۆژانە لەگەڵ منداڵەکەتدا چیرۆکێك بخوێنیتەوە، لەوانەیە چارەی کێشەکانی پیشان بدات" یان هەندێ ئارامی و ئۆقرەیی پێ ببەخشێت، یاخود لەوانەیە هەندێ بەهرە و شارەزایی تێیدا گەشە بکات.

خـوای گـەورە بەرەکـەت بخاتـە تواناکانتـەوە، چـاوەکانت بـە ساڵحبوونی منداڵەکانت ئاسوودە بکات.

*** 

## • کچەکەم و سەرسامبوونی بـە ئەسـتێرە و پاڵـەوانی فیلمەکان

**پرسیار:**

**≡ من دایکێکم، خۆچاودێریکردن لە لای کچـە بچـووکەکەم بەهێز دەکەم، هەوڵیش دەدەم بۆی ببمە پێشەنگێکی باڵا، ئەو کەناڵ و بەرنامانەی هەست دەکەم زیان بە ڕەوشتی دەگەیەنن دایانبخەم" بـەڵام جـاری وا هەیـە لـە قوتابخانـە دەگەڕێتـەوە یـەکێك لـە دەستەخوشکەکانی باسی ڤیدیۆیەك، یان زنجیرە درامایەکی بۆ کردووە، کە شتی خراپی تێدایە، باسی پاڵەوان و ئەستێرەکانی ناو فیلمەکان دەکات و هانی دەدات لاسایی کارەکانیـان بکاتـەوە، کچەکەیشـم سەرسام دەبێت بەمە! چون ڕێگری لە منداڵەکەم بکەم نەکەوێتە ژێر کاریگەریی دەستەخوشکەکانی؟**

**وەڵام:**

* سەرەتا پێویستە هەڵنەچیت کاتێك شتێکت پێ ڕادەگەیەنێت، کە گوێی لێ بووە و شتەکە گونجاویش نییە، تا بەردەوام بێت لە قسەکانی و هەموو شتێکت پێ دەڵێت.

* لەسەر ئەنجامدانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە یارمەتیی بدە، هەروەها توانای هەڵسەنگاندنی ئەو شتانەی هەبێت، کە گوێی لێ دەبێت لەبارەی فیلمەکان، یان ئەو شتانەی لە ڕەفتارەکانیان دەیبینێت. تۆیش دەتوانیت لایەنی ڕاست و هەڵە، باش و خراپی بۆ ڕوون بکەیتەوە، ئەمەیش دەکرێت لە ڕێی هەندێ پرسیارەوە بێت لەبارەی ئەو شتانەی گوێی لێ بوون (چی؟)، (بۆ چی؟)، (چۆن)، (کەی؟)، (لە کوێ؟)، (کێ)... بەم جۆرە پرسیارە گفتۆگۆی لەگەڵ بکە، بۆ وێنە:

چ شتێك سەرنجتی ڕاکێشاوە؟ هەڵسوکەتی فلان بۆ تۆ خراپ بوو؟

چاوەڕێ دەکەی چ شتێك ڕووبدات؟ بۆچی ئەمە باشە، یان خراپە؟

بۆ وا دەکات؟ وا دەڵێت؟

چۆن دەتوانین لەمە دڵنیابین، کە...؟

چۆن دەکرێت پەیوەندییەکە...؟

چ دەکاتێك دەکرێت ئەم کارە بکرێت...؟

چ کەسێك سوود لەمە دەبینێت...؟

پرسیاری ڕاوبۆچوونی لێ بکە لـەبارەی ئـەو شـتەی گوێبیسـتی بووە، ئایا حەقیقەتە، یان تـەنیا دەربـڕینی ڕاوبۆچـوونە؟ ئایـا ئـەو هاوڕایە، یان لە دژ؟ ئـەو کەسـەی قسـە دەکـات، بەڵگـەی لەسـەر قسەکەی چییە؟ جیاوازیی نێوان ئەو هەڵوێستە لەگەڵ هەڵوێسـتێکی تردا چییە؟ شوێنەواری جێماوی ئەم کارە چییە...؟

لـە بەرامبـەردا پێویسـتە لـە وەڵامـەکانی تێبگـەیت گەرچـی سادەیش بن" هەروەها پێویستە سەرجەم وەڵامەکانی بە سینگفراوانی وەربگریت، زۆر بەجوانی گوێی بۆ شل بکە، کاتی بدەرێ، تا بەر لـە وەڵامدانـەوە بـیر بکاتـەوە. بیرکردنـەوەی ڕەخنەگرانـە سـەلیقەیەکە بەئاسانی فێری نابێت و گەشەی پێ نادرێت، پێویستی بە ئارامگرتن و کۆڵنـەدان هەیـە، تـا بـە پشـتیوانیی خـوا دەبێتـە بیرمەنـدێکی ڕەخنەگر.

* فێری بکە، کە هەرچی دەیبینێت لەسەر شاشەکان لە جـوانی و باقوبریقیی ئەکتەر و ئەستێرە و پاڵەوانان، چەند هۆکارێکیـان لـە پشتەوەیە، گروپێکی تەواو هەیە لە شارەزایانی بـواری جوانکـاری و قژداهێنانن و نەخشەسازی جلوبەرگ و ڕاهێنەران بـۆ ئەکتـەرەکان.. پێی بڵێ، کە هەندێ فێڵی سـینەمایی هـەن شـارەزایانی فیلمسـازی دەیانزانن، تا وا بکەن ئەکتەر و پاڵەوانەکان جوانتر و ئازاتر و بوێرتر

لەوەی لە واقیعدا هەیە دەربکەون، تا ببێتــە هــۆی سەرنجڕاکێشــانی بینەران.

* بــۆ چارەســەری سەرســامبوونی بــە ئەســتێرە و پاڵــەوانی فیلمــەکان، دەکرێــت شــێوازی گێڕانــەوەی چــیرۆکی پاڵەوانــە ڕاستەقینەکان بەکاربهێنیت، پاڵەوانەکانی ئوممەتی ئێمــە بەدرێــژایی مێژوو خاوەنی جوانترین چیرۆکن، لەوانە:

- (النعمــــان)ی کــــوڕی (بشــــیر) ﷺ یەکــــەم لــــەدایکبووی ئەنسارییەکانە دوای کــۆچ، لــە جــەمادی دووەمــی ســاڵی دووەمــی کۆچیدا لەدایك بــووە، کاتێــك پێغەمبــەری خــوا ﷺ وەفــاتی کــرد، تەمەنی نوعمان نۆ ساڵان بوو، بەڵام فەرموودەی گێڕاوەتەوە، یەکێك لەو فەرموودانە: (**حەڵاڵ دیارە و حەرامیش دیار، لە نێوانیاندا چەند شتێکی گوماناوی هەن**).

- هاوەڵی موجاهید خاتوو (أسما ﵂) کچی (ابوبکر)، خــاوەن دوو پشتێن (ذات النطاقین)، کاتێك بوو بــە موســڵمان تەمــەنی چــواردە ساڵان بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، لــە ڕێــی کۆچدا خواردنی بــۆ دەبــرد. کاتێــك ویســتی توێشــووی خواردنەکــە ببەستێت، هیچ پەتێکی گونجاوی دەستنەکەوت، ناچــار پشــتێنەکەی خۆی کرد بە دوو پارچەوە، بە پارچەیەك خواردنەکــەی پــێ بەســت و بەویتر دێمکەی ئاوی پێ بەست" بۆیە نــاوی (خــاوەن دوو پشــتێن)ی لێنرا. پێغەمبەری خوا ﷺ دۆعای ئەوەی بۆ کرد، کە خوای گەورە لە بەهەشتدا بۆی بگۆڕێتەوە بە دوو پشتێنی تر.[1]

---

[1] بابەتێك بە ناونیشانی (الشباب في السیرة النبویة)، ماڵپەری (طریق الإسلام).

- (معـاذ)ی کوڕی (جبل)، کە تەمەنی سیانزە ســاڵ بــوو لەگــەڵ (معوذ)ی کوڕی (عفرا ﭫ)، کە تەمەنی چواردە ساڵ بوو، لــە جــەنگی بەدردا (ئەبو جەهل)یان کوشت، کە سەرکردەی سوپای بێباوەڕان بوو لەم جەنگەدا.

- (زید)ی کوڕی (ثابـت) تەمەن سیانزە ساڵان، نووســەری وەحــی بوو، لە ماوەی ١٧ ڕۆژدا فێری زمانی یەهوودی و سریانی بوو، بــوو بە وەرگێڕی تایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، قورئانی پیرۆزی لەبەربوو، بەشداربوو لە کۆکردنەوەی قورئاندا.[١]

* فێری ئازایەتی و بوێریی بکە، بڕوابەخۆبوونی پێ ببەخشــە، تا بتوانێت بە هاوڕێ کچەکانی بڵێت حــەز ناکـات گوێبیســتی ئــەم جــۆرە هــەواڵ و دیمەنانــە بێــت، بــۆ نموونــە: (کچــێك حــەزی لــە گوێبیستبوونی گۆرانی و سەیرکردنی زنجیرە دراماکان نەدەکرد، بۆیــە گەر بچوایەتە لای دەستەخوشکەکانی ئەوان، کە ئەوان قسە و باســی سەبارەت بەم جۆرە بابەتانەیان دەپچڕاند، وەك ڕێزێك بۆ ئەو کچــە و حەزەکانی).

خوای گەورە سەرکەوتووت بکات و لــە جــوان پــەروەردەکردنی کچەکەت هاوکاریت بکات.

* * *

[١] بابەتێك بە ناونیشانی (قادة صغار لكنهم كبار)، ماڵپەری (الألوكة).

## • چۆن منداڵ دەتوانێت کاریگەریی لەسەر دەوروبەری خۆی هەبێت؟

پرسیار:

**≡ دایـك چـۆن دەتوانێـت منداڵەکـەی وا پـەروەردە بکـات یادخەرەوە و کاریگەر بێـت بەسـەر دەوروبـەری و سـوودیان پـێ بگەیـەنێت، نـەوەك بـۆ هاوتەمەنـەکانی و نزیکـەکانی ببێتـە ڕێنیشاندەری خراپە؟**

**وەڵام:**

خۆشەویستم دایکی بەخشندە! پرسیارێکی پڕمانایـە بـە چـەند وشـەیەکی کـەم، بـەو پێیـەی تـۆ دەتـەوێت منداڵەکـەت ببێتـە سوودبەخش بۆ دەوروبەری، واتای وایە دەتـەوێت ببێتـە سـەرکردە و ڕابەریان و گرنگییان پـێ بـدات، بـۆ لای خـۆی و بیروبۆچـوونەکانی ڕایانبکێشێت. دەکرێت بە ڕەوشتی بەرز و خەسـڵەتی جـوان لایـەنی جوامێرییـان بـۆ ئەنجامـدانی کـاری بـاش تێـدا بورووژێنێـت، بـە پشتیوانیی خوا ئەم کارە دەکرێت، ئەویش بـە بەدەسـتهێنانی چـەند کارامەییەك، لێرەدا بە کورتی باسیان دەکەین:

١- گەشەپێدانی گیانی دەستپێشخەری لای منداڵ:

دەستپێشخەری بە واتـای (پێشـکەوتن دێـت، پێشـکەوتن لـەو شتانەی دەکرێت بە ئامانجی گۆڕانکاری پێشکەوتنیان تێـدا بکرێـت، ئەوانیش چەند کارێکی ستاییشکراون، دەکرێـت دەستپێشـخەری بـە وتار بێت، یان بە کردار)، ئەمەیش سیفەتێکە لە سیفەتەکانی بەنـدە باوەڕدارەکانی خـوا، وەك پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴾ (المؤمنون: ٥٧ - ٦١)

واتە: "بەڕاستی ئەوانەی، کە ترسی پەروەردگاریان لـە دڵدایـە و دەترسن لێیان بڕەنجێت.. ئەوانەیش بڕوا بـە ئایـەت و فەرمانـەکانی پەروەردگاریان دەهێنن.. ئەوانەیش، کە هاوەڵ و هاوبەش و شـەریك بۆ پەروەردگاریان بڕیار نادەن.. ئەوانەیش، کە دەبەخشن و لە زەکات و خێر دڵیان دەترسێت، نەوەك لێیان وەرنـەگیرێت.. چـونکە ئەوانـە بێگومانن، کە بۆ لای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە.. ئا ئەوانە بەپەلەن بۆ ئەنجامدانی هەموو چاکەیەك و پێشبڕکێیش دەکەن لە چاکەدا".

دەکرێت گەشەپێدانی ئەو گیانە بەم ڕێگەیانە ئەنجام بدرێت:

- پێشەنگایەتیی دروست: کاتێ دایك بۆ منداڵەکـەی دەبێتـە پێشـەنگ، ئـەویش بـە دەستپێشـخەریکردن لـە کـاری خێـر و یارمەتیدانی هەژاران و کەسانی پێویست، یان هەر کارێکی باش، کە منـداڵ هەسـتی پـێ بکـات، ئـەوکات گرنگیـی دەستپێشـخەری

دەردەکـــەوێت" هـــەروەها گرنگیـــی بەشـــداریکردنی منـــداڵ لـــە یارمەتیدانی کەسانی تر و سەرقاڵنەبوون بە خۆیەوە.

– هاندانی منداڵ لەسەر هەوڵـدان: ئـەویش بـە هانـدانی، تـا خزمەتێك پێشـکەش بکـات و لـە شکسـتهێنان نەترسـێت، لەسـەر بەرگەگرتنیش ئارام بگرێت و لە پێگەیشتنی بەروبوومەکـەی پەلـەی نەبێت یان زیاد لە توانای نەخرێتە ئەستۆ. دەبێت دایکەکە بۆی ڕوون بکاتەوە، ئەگەر هـەوڵ بـدات پاشـان شکسـت بهێنێـت زۆر باشـترە لەوەی، کە هەر هەوڵ نەدات.

– هەلی زۆر و جۆراوجۆر: دایك بۆ منداڵەکـە ڕوون بکاتـەوە، کە هەلی دەستپێشخەری زۆرن، پێویستە گونجاوترینیان هەڵبـژێرێت، چاوەڕێی پاداشتیش لە خوای پەروەردگار بکات، پێغەمبەری ڕەحمەت ﷺ دەفـەرموێت: (**هەرکەسـێك یارمــەتیی براکـەی بـدات، خـوای گەورەیش یارمەتیی ئەو دەدات، هەرکەسێکیش خەم و پەژارەیەك لەسەر موسڵمانێك لاببات، ئەوە خوا خەم و پەژارەیەك لە خـەم و پەژارەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر لا دەبات**).[1]

هەروەها دەفەرموێت (**هەرکەسێك بانگەواز بۆ هیدایەت بکات، هەمان پاداشتی ئەو کەسانەی دەبێت، کە دوای هیدایەتەکە دەکەون بێ ئەوەی لە پاداشتیان کەم ببێتەوە" هەرکەسـێکیش بانگـەوازی گومڕایی بکات گوناهی هەمان ئەو کەسانەی بۆ دەنووسرێت، کـە**

[1] بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

**دوای گومڕاییەکە دەکەون، بێ ئەوەی لە گوناهەکانیان کەم ببێتەوە).[1]**

یەکێك لە دایکەکان دەڵێت: "لە پشووی هاوینەدا کوڕەکانم کۆکردەوە، گفتۆگۆکەمان دەربارەی ئەوە بوو، کە چۆن مرۆڤ بتوانێت بۆ هاوڕێکانی ببێتە سەرکردەیەك بۆ چاکە، دروشمان ئەمە بوو (هاوڕێکانم دەرفەتێکی باشن بۆ زیادکردنی چاکەکانم). بوارم پێدان بیر لەوە بکەنەوە، کە چ شتێك پێشکەشی هاوڕێکانیان بکەن و بەیەکەوە بەشداربن لە کارێکدا. لە دیاریکردنی بیرۆکەدا یارمەتیم دان، دواتر دەستمان کرد بە جێبەجێکردنی، بەبێ زیادەڕۆیی ئەم دەستکەوتە لە هەرە جوانترین دەستکەوتەکانی ژیانی کوڕەکانم بوو).[2]

٢- گەشەپێدانی متمانەبەخۆبوون لای منداڵ:

کەسی کاریگەر لەسەر دەوروبەری، بێگومان دەبێت کەسێکی جێی متمانە بێت، ئەم کارەیش ناکرێت، مەگەر متمانە بەخۆی و بە هێزەکانی خۆی نەبێت. دەبێت لەم ڕووەوە منداڵ ڕاهێنانی پێ بکرێت تا متمانەبەخۆبوون بەدەست دەهێنێت، ستاییشی بکرێت و گرنگییەکەی بۆ دەربخرێت. ئەم بابەتە پێشووتر باس کراوە بە ناونیشانی (منداڵەکانم و لاوازیی متمانەبەخۆبوونیان)، لەوێ

---

[1] موسلیم گێڕاویەتییەوە.

[2] سەیری (كيف تصنع من طفلك الصغير رجلا كبيرا) بکە.

چۆنێتیی بەدەستهێنانی متمانەبەخۆبوونی منداڵی تێدا باس کراوە.

٣- گەشەپێدانی بەرپرسیارێتی لای منداڵ:

منداڵی یادخەرەوە و کاریگەر بۆ دەوروبەری، دەبێت کەسێکی بەرپرس بێت. منداڵ، کە لەدایك دەبێت بەرپرسیارێتی نازانێت، بۆیە پێویستە وردە وردە فێر بکرێت، فێرکردنیشی کاتی زۆری دەیەوێت" ئەم کارەیش ئەوکات دەست پێ دەکات، کە منداڵەکە ئامادەیی نیشان دەدات، هەرچەند تەمەنیشی بچووك بێت. ئینجا پێویستە هان بدرێت و یارمەتی بدرێت و لەسەر وەرگرتنی بەرپرسیارێتییەکە ڕاهێنانی پێ بکرێت، بەڵام بەبێ فشاربۆهێنانی زۆر. ئەوەی، کە یارمەتیی ئەم بابەتە دەدات ئەمانەن:

- ڕێگەپێدان بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی خۆی داوایان دەکات، گەر ویستی بە گسك ماڵ پاك بکاتەوە، یان وەڵامی تەلەفۆن بداتەوە، یان شیر بداتە برا بچووکەکەی... تۆ ڕێگەی پێ بدە، وازی لێ بهێنە تاقیی بکاتەوە، بەمەیش فێردەبێت چۆن کارەکان بە شێوەیەکی دروست ئەنجام بدات.

. - ڕاسپاردنی منداڵ بۆ هەندێ ئەرك و کاری سادە، بەگوێرەی تەمەنی ئەرکەکانی زیاد بکرێت. دەتوانێت جلوبەرگی خۆی هەڵبواسێت، یارییەکانی ڕێکبخات، یان پێڵاوەکانی لە شوێنی خۆی دابنێت.

- پلەپلە بەرپرسیارێتیی پێ بدرێت و ڕاهێنانی لەسەر بکات،

بەوپێیەی، کە دەگاتە تەمەنی حەوت ساڵان بتوانێت کارەکانی بە تەنیا ڕاپەڕێنێت، بخوات و بخواتەوە و جلوبەرگ بپۆشێت و ژوورەکەی ڕێکبخات...

– کاتێك منداڵەکە دەڵێت (ئەم کارە بێزارکەرە، حەزم لێ نییە بیکەم)، پێویستە بەزیرەکی کارەکەی لا خۆشەویست بکەیت، بەرپرسیارێتییەکان هەمەجۆر بکە، لە هەندێکیاندا بەشداریی پێ بکە... لەبارەی جێبەجێکردنی هەندێکی تریشەوە پرسیاری لێ بکە: ئەم وێنەیە لە کوێ هەڵبواسین؟ چۆن دیکۆری ژوورەکە بگۆڕین؟ ڕای وەربگرە.

– پیاهەڵدان و ستاییشکردنی منداڵ لەسەر ئەنجامدانی کارەکانی، با زۆریش بچووك بن، ئەمەیش بۆ ئەوەی هەست بە ڕەزامەندبوون و ڕێزلێگرتنی خۆی بکات" هەروەها هانی دەدات بۆ کردنی کاری زیاتریش.

– سەرئەنجامی کەمتەرخەمی و پشتگوێخستنەکانی بخرێتە ئەستۆ، ئەو شتانەیشی خراپی کردوون چاکیان بکاتەوە، ئەمە وا دەکات لە هەمبەر هەڵسوکەوت و ئەو شتانەی هەیەتی هەست بە بەرپرسیارێتی بکات.

– یارمەتیدانی منداڵ لە دەرکردنی بڕیار، هاندانیشی، تا بە جوانترین شێوە پێی هەڵبستێت، بۆ نموونە: شوێن و کاتی گەشتکردن، ئەو چالاکییانەی لەمیانەیدا دەکرێن، لەگەڵ خواردنی گەشتەکە

دیاری دەکات.[١]

- بەشدارییپێکردنی لە کاری بەکۆمەڵ:

بە کاری هاوبەشی و بەکۆمەڵ منداڵ ڕادەهێنرێت چۆن ئامانجە هاوبەشەکان دیاری بکات، کۆڵنەدان و ئارامگرتن و هاوکاریکردن فێردەبێت، هەلی ئالوگۆڕکردنی ڕۆڵەکانی بۆ دێتە پێش" هەروەها ڕەچاوکردنی مافی کەسانی تر و ڕێزگرتن لە دید و پەیامیان. ئەم کارەیش بە چوونی منداڵ بۆ نێو گرووپەکانی (خاوەن ئامانجە پیرۆزەکان) دەبێت، وەك گرووپی مزگەوت، خێوەتگای هاوینان، چالاکییەکانی قوتابخانە، خولەکانی هاوینە و... هتد.

٤- بە دەستهێنانی کارامەیی بڕواپێهێنان و وتاردان.

بە دەستهێنانی ئەم کارامەییە وا لە منداڵ دەکات توانای هەبێت کاریگەریی بەسەر دەوروبەرییەوە هەبێت. لێرەدا چەند ڕێگەیەك بۆ گەشەپێدانی ئەم کارامەییانە دەخەینەڕوو:

- **کارامەیی بڕواپێهێنان:**

- فێربکرێت کاتی گونجاو بۆ قسەکانی دیاری بکات، چونکە قسە و بیرۆبۆچوونەکان قەبووڵ ناکرێن، ئەگەر کاتەکە نەگونجاو بوو، تەنانەت ئەگەر بیرۆکەکەیشی باش بێت.

---

[١] سەیری (ابن زمانە، عبدالکریم بکار) بکە، لاپەڕە (١٢٨).

- دەبێت سەرەتا خۆی باوەڕی بەو بیرۆکەیەی هەبێت، کە دەیەوێت خەڵك باوەڕی پێ بکات.

- پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر گفتوگۆ، بە جۆرێك منداڵ دیدوبۆچوونی خۆی بۆ کەسێکی تر ڕوون بکاتەوە، لە هەمان کاتدا کەسی بەرامبەریش ئازادە ئەو شتە وەربگرێت، کە پێیوایە دروستە.

- بۆ بڕواپێکردن، منداڵ فێربکرێت سەرەتا لەو شتەوە دەست پێ بکات، کە لەگەڵ کەسی بەرامبەردا لەسەری ڕێککەوتوون.

- منداڵ فێربکرێت بیروبۆچوونەکانی بەگوێرەی توانای ئاسان بکات و ڕوونیان بکاتەوە، جەخت لەسەر یەك بیرۆکە بکاتەوە، بە جوانی و نەرمونیانی وتووێژی لەسەر بکات، خۆی بە ئارامگرتن و لەسەرخۆیی بڕازێنێتەوە، تا دەگات بە ئامانجەکەی.

- **کارامەیی وتاردان:**

- منداڵ هان بدرێت لە بەرامبەر دایك و باوکی و براکانی قسە بکات، ماوەکەی لە پێنج خولەك تێپەڕ نەکات، هەروەها خۆیشی بۆ ئامادە بکات و ڕاهێنانی لەسەر بکات.

- منداڵ هان بدرێت هەندێك ئایەتی پیرۆز و فەرموودەی کورت لەبەر بکات و لە کاتی قسەکردنیدا پشتیان پێ ببەستێت.

- بەدەستهێنانی کارامەیی وتاردان بەخێرایی نایەتەدی، بەڵکو پێویستی بە ئارامگرتن و کۆڵنەدان و خۆئامادەکردنی باش هەیە.

خوای گەورە یارمەتیت بدات و سەرفرازت بکات، منداڵەکەیشت بکاتە نوور و هیدایەت بۆ دەوروبەری.[1]

*** 

- **جۆراوجۆری ڕێگەکانی بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن:**

**پرسیار:**

≡ ئەو کێشەیەی دێتە بەردەمم ئەمەیە: من لەبارەی خۆچاودێریکردنی منداڵەکەمەوە هەموو هەڵسوکەوتی نهێنی و ئاشکرای دەبەستمەوە بە ڕەزامەندیی خوای گەورەوە، دەقەکانی قورئان و فەرموودە بەکاردەهێنم. بۆ نموونە: کاتێك بیەوێت دەستدرێژی بکاتە سەر کەلوپەلی کەسانی تر، ئەم فەرموودەی بە گوێدا دەدەم (موسڵمان ئەو کەسەیە، کە موسڵمانان لە دەست و زمانی پارێزراوبن). ئەگەر دەنگی بەرزبکاتەوە، پێی دەڵێم (واغضض من صوتك: دەنگت نزم بکەرەوە). ئەوکات منداڵ هەست دەکات، کە فەرمان و قەدەغەکردنەکان لە لایەن خوای پەروەردگارەوەن.. دوای جێگیربوونی ئەم چەمکە لە لای، ئینجا لە کاتی تەنیاییدا بابەتی خۆچاودێکردنی بە گوێدا دەچرپێنم و پێی دەڵێم: (ألم يعلم بأنّ الله يرى: ئایا نازانیت خوای گەورە دەتبینێت؟)، بەتەواوەتییش خۆم

[1] سەیری (ابن زمانه، عبدالكريم بكار) بکە، لاپەڕە (١٢٨).

بەدوور دەگرم لەوەی ڕۆڵــی دایکێکــی نائاســایی ببیــنم، کــە هــەوڵ دەدات هەرچی منداڵەکەی لە تەنیاییدا دەیکــات بیزانیــت، یــان بــە منداڵەکە ڕابگەیەنم، کە من بەرنامەی چاودێریکردنم لەسەر ئــامێرە ئەلیکترۆنییەکەی داناوە، چونکە ئەمە وا دەکات زیاتر لە چــاودێری مرۆڤ بترسێت لەسەر حیسابی چــاودێریی خــوایی" بــەڵام بــاوکی بــە چاودێریکردنی خۆی لەسەری دەیترسێنێت، وا هەست دەکات بەردەوام چاوی لەسەرە، کەلوپەلەکانی دەپشکنێت، پێــی ڕادەگەیــەنێت دوای تەواوبوونی" تۆمار ئینتەرنێتەکە دەکاتەوە، تا بزانێت چی کردۆتەوە؟

ئێستا پرسیارەکەم ئەمەیــە: چارەســەر چــییە؟ ئایــا ئــەم باوکــە کاریگەریی گەورەی دەبێت لەســەر شــێواندنی ئــەو کــارەی مــن دەیکەم؟

**وەڵام:**

دایکی خۆشەویستم! دەستخۆشیت لێ دەکەم بۆ شێوازە جوانــەی پەروەردەکردنی منداڵەکەت، خــوای گــەورە بەرەکەتــدارت بکــات و ساڵحبوونی کوڕەکەتت پێ ببەخشێت.

بزانە هەندێ کاروبار لەبەر ئــەوەی پەیوەندیــدارن بــە کەســێکی ترەوە، ناتوانین بۆ خۆمان بیــانگۆڕین، یــان بەتــەواوی دەســتکارییان بکــەین، هــەر لــەدەرەوەی کــۆنترۆڵی ئێمــەدا دەمێننــەوە. لێــرەدا لەسەرمانە لە چوارچێوەی ئەوەدا کار بکەین، کــە پێمــان دەکرێــت، وەك ئەمانە:

* بە زۆر نزاکردن و پاڕانەوە، پشت بە خوا ببەستە، لە ئاشکرا و پەنهاندا خوو بگرە بە نزاکردنەوە، کە خوا منداڵەکەت بپارێزێت و لە هەرچـی خراپـە هەیـە بـەدووری بگرێـت، وەك ئـەم دوعایانـە:
﴿رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ﴾ (إبراهيم: ٤٠)

واتە: "پەروەردگارا! خۆم و نەوەکانم بگێـڕە لـەو کەسـانەی، کـە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی. پەروەردگارا! دوعاو نزام گیرا بکە".

﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ (الفرقان: ٧٤)

واتە: "ئەوانەیشـن، کـە دەڵـێن: پـەروەردگارا! لـە هاوسـەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پـێ ببەخشـە، کـە ببنـە مایـەی ڕوونـاکیی دیدەمان و شادومانی دڵمان و بمانکـە بـە پێشـەوا بـۆ پارێزکـاران و خواناسان".

﴿ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ ﴾ (الأحقاف: ١٥) واتە (پەروەردگارا! کۆمەکیم بکـەو یارمـەتیم بـدە، تـا شـوکرانەبژێر و سوپاسـگوزاری ئـەو نازونیعمەتانە بم، کە بە من و دایك و باوکمت بەخشـیون. هـەروەها یارمەتیم بدە لەو جۆرە کار و کردەوە چاکانە ئـەنجام بـدەم، کـە تـۆ پێیان ڕازییت، داواکاریشم چـاکە بروێنیـت لـەناو نەوەکانمـدا لەبـەر قازانجی خۆم".

* بەردەوام بە لەو شێوازەی پەیڕەوت کردووە لە بەستنەوەی حوکمە شەرعییەکان بە ئایەتە پیرۆزەکان و سوننەتە خاوێنەکانەوە، دەکرێت سوود لەم کتێبەیش وەربگریت لەو چالاکییانەی تێیدایە، ئەوانە گونجاون لەگەڵ قۆناغی تەمەنی.

* لەسەرتە پەیوەندیی نێوان خۆت و منداڵەکەت بەهێز بکەیت، تا پەیوەندییەکە بەهێزتر بێت، هێزی کاریگەریت زیاتر دەبێت. بەدرێژی باسی ئەم خاڵە کراوە لە کێشەیەکدا بە ناونیشانی (کچەکەم لێم وەرناگرێت).

* ئاساییە دید و بۆچوونی هاوسەرەکان جیاوازبن ئەمیش بەهۆی جیاوازیی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی و لایەنی ترەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بگەنە چارەسەرێکی ئەوتۆ بۆ ئەم ڕاجیایی و دژیەکییە، کە لە بەرژەوەندیی منداڵەکە بێت، ئەمەیش دەکرێت بەم شێوەیە بێت:

- گفتوگۆ و وتووێژ لە نێوان خۆت و باوکی منداڵەکەت لەبارەی بەهێزکردنی خۆچاودێریکردنی منداڵەکەتان لە کەشێکی ئارام و هێمن و پڕاوپڕ لە خۆشەویستی و ڕێزەوە بەڕێوەبچێت. دەکرێت بۆ ڕوونکردنەوەی دید و بۆچوونەکانت و تێگەیشتنیان و هەڵبژاردنی کات و شوێنی گونجاو دوور لە دیتن و بینینی منداڵ، پشت بە ئەزموونی خەڵکانی تر ببەستیت.

- بەکارهێنانی ڕێگەی ناڕاستەوخۆ بۆ چارەسەری کێشەکان، یەکێك لە دایکەکان دەڵێت: "بۆ چارەسەرکردنی کێشەی قوتابییە

کچەکانم ڕاوێژم بە هاوسەرەکەم دەکرد و ڕاوبۆچوونیم وەردەگرت، بـۆ ڕۆژی دواتر سوپاسیم کرد، چونکە ڕاوبۆچوونەکەی دروست بوو، دوای ماوەیەك وای لێ هات هاوسەرەکەم زیاتر لە جاران ستاییشی شێوازی پەروەردەکردنمی دەکرد".

خوای گەورە سەرکەوتووت بکـات و کاروبـارت ڕاسـت بکـات و ڕێزدارت بکات، هاوسەر و مـنداڵەکانت بۆ ساڵح بکات.

❊❊❊

## • منداڵەکەم و پاراستنی نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا:

**پرسیار:**

**≡ کاتێك دەست دەکەم بە بەهێزکردنی خۆچاودێریکردن لە لای منداڵەکەم، ئەو هەنگاوانە چین بیانگرمەبەر، تا پارێزگاری لە نوێژەکانی بکات لە کاتی خۆیاندا؟**

**وەڵام:**

خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە لەسەر گرنگیدان بە منداڵەکەت لەسەر نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا، چەند ڕێگەیەك باس دەکەین، کە بە پشتیوانیی خوا لەم ڕووەدا یارمەتیت دەدەن:

* ئەگەر منداڵەکەت بچووکە، ئەوا پێویستی بە بیرهێنانەوەی بەردەوام هەیە، هەرکە چووە ناو کاتی نوێژ، لەوانەیە خۆی نەتوانێت کاتەکانی نوێژی ڕێك بخات، لەوانەیە سەرقاڵی یاری بێت و پێویستی بە کەسێك هەبێت بیری بخاتەوە، پشت بە خوا ببەستە و بێزار مەبە و سستی داتنەگرێت.

* وا مەکە کاتی نانخواردن هەمان کاتی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی خەوتنان بێت یان نوێژەکانی تر، بەڵکو پێشی بخە، یان دوای بخە.

* بۆ دەستنوێژگرتن ئاوی گەرمی بۆ ساز بکە، گەر کەشوهەوا سارد بێت.

* کاتێکی تەواوی پێ بدە بۆ نووستن، با بەر لە کاتی نوێژ نەخەوێت، پاشان بۆ نوێژ هەڵنەستێتەوە.

* هەندێ جار بەرپرسیارێتی بیرهێنانەوەی نوێژی بخەرە ئەستۆ، هەر کاتێك گوێی لە بانگ بوو.

* پاداشت پێدانی دوای ئەنجامدانی نوێژ، نەك بەر لە ئەنجامدانی (جا ئەگەر پاداشتەکە ماددی بێت، یان مەعنەوی).

* وا بکە وادەی کاروبارەکان ببەستیتەوە بە کاتەکانی نوێژەوە، وەك ئەوەی بڵێیت سەردانی خزمان دوای نوێژ دەبێت، یان دەرچوون بۆ نانخواردن، یان بۆ پارك و شتی تر.

* دەکرێت ئامێرێکی (بێدارکەرەوە)ی تایبەتی بۆ بکڕیت، سەرەتا بە هاوکاریی تۆ کاتەکانی نوێژی بیر بهێنێتەوە.

* زۆر پاڕانەوە لە خوای گەورە بە دۆعاکردن: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ﴾ (إبراهيم: ٤٠)

واتە: "پەروەردگارا! خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی، کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی. پەروەردگارا! دوعاو نزام گیرا بکە".

خوای پەروەردگار خۆت و منداڵەکەت سەرفراز بکات و لە پیاوچاکانتان بگێڕێت.

* * *

# ناوەڕۆك

بەشی سێیەم

**03** SMART DEVICES AND THE CURRENT GENERATION

# ئامێری زیرەك و منداڵی سەردەم

بابەتی خۆچاودێریکردن لە لای منداڵ لە بابەتە هەرە گرنگەکان ئەژمار دەکرێت، کە کۆمەڵگە زۆر پێویستی پێیەتی. مەبەست لە خۆچاودێریکردن بریتییە لە: چاندنی ئەو بەهایانەی، کە وا لە منداڵ دەکەن خۆی چاودێریی ڕەفتارەکانی خۆی بکات.

ڕێگەکانی خۆچاودێریکردن منداڵ چەند جۆرێکن، لەوانە ڕاستەوخۆ، هەیشیانە ناڕاستەوخۆ، وەک: ئامۆژگاری بە چیرۆک و سوودوەرگرتن لە ڕووداوەکان، خوێندنەوە و ڕاهێنان ئەنجامدان.

لە ئێستادا جیهان لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بە گەشەپێدان و ڕاهێنانی منداڵ هەیە لەسەر بابەتی خۆچاودێریکردن، چونکە پێشکەوتنی خێرای زانست و تەکنەلۆژیا بۆ ئامێرەکانی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، ئاسان دەستگەیشتنی منداڵ و هەرزەکاران پێیان و بەدەستهێنانی زانیارییەکان، لەوانەیە کاریگەرییەکی ئێجگار خراپیان هەبێت ئیتر چ لەسەر لایەنی ئایینی بێت، یان لەسەر لایەنەکانی تر وەک: ڕەوشتی، پەروەردەیی، دەروونی، کۆمەڵایەتی و تەندروستی.

نرخی 4000 دینار


9 789922 690476

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com